# پرشنگی رۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری

دانەر
مەلا حسین شێخ سعدی

نووسینەوەو ئامادە کردنی بۆ چاپ
بەشیر حسین سعدی

بەرگی شەشەم
لە ساڵی ١٩٥٢ دانراوە

# پرشنگی ڕۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری

دانەر
مەلا حسین شیخ سعدی

بەرگی شەشەم

نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ
بشیر حسین سعدی

لەساڵی ١٩٥٢ داندراوە

**پرشنگی رۆژی کوردەواری لەشەرحی بوخاری**
**نووسینەوەو ئامادەکردنی بۆ چاپ: بەشیر حوسێن سەعدی**
**کۆمپیوتەر: نووسینگەی [illegible]**
**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**
**چاپخانەی ئۆفسێتی هەولێر**

ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی هەرێمی کوردستان
ژمارە ( ١٠٣ ) ی ساڵی ١٩٩٩ی دراوەتێ.



**وێنەی دانەر**
**مەلا حسین شێخ سەعدی**
**١٩٨٣-١٨٨٣**

# مێژووی ژیانی دانەرو داندراوەکانی لەچەند دێڕێکدا

## ١٨٨٣-١٩٨٣

ناوی تەواوی مەلا حسین شیخ سەعدی فەیزوللایە نازناوی لەئەدەب (فانی)یەو لەهەندێ هەڵبەستی نازناوی (کاکە)ی هەڵبژاردووە. بەرەچەڵەک لەعەشیرەتی بلباسە لەتیرەی (بەرچەم لەساڵی ١٨٨٣ لەشاری هەولێر هاتۆتە دونیاوە لەتەمەنی شەش ساڵیدا لەبەر خوێندن داندراوە لەمزگەوتی گەورەی هەولێر کە ناسراوە بە مزگەوتی بازاڕ پاشان لەزۆر جێگا گەڕاوە بۆ خوێندن لای مەلا ناودارەکانی ئەوکاتە وەکو مەلا عبداللەی جەلی زادەو مەلا صادق لە مزگەوتی شێخ جامی لەشاری کۆیێ و لای مەلا ئەحمەدی سکتان و اجازەی مەلایەتیشی لەهەولێر لای مەلا بی بکر عمر افندی وەرگرتووە کە ناسراوە بە (مەلا فەندی).

بۆ یەکەم جار لەگوندی قەپلان بوەتە مەلا پاشان چووە گوندی سیاوو خورمەڵەو سوریژەو دووگردکان لەساڵی ١٩٤٧ لە دووگردکانەوە هاتە هەولێر بوو بە مەلای مزگەوتی -دارتاشان-.

لەماوەی ژیانیدا هەروەکو خۆی دەی فەرموو (٣٠) سی ساڵ هەر خەریکی خوێندن بووە و (٢٤) بیستو چوار ساڵیش دەرسی بە فەقێیان گوتووە لەو گوندانەی باس کراو هەر خەریکی دانانی پەرتووکی ئایینی و دانانی هەڵبەست بووە، ئەوا لەخوارەوەش داندراوەکانتان بۆ باس دەکەین.

١- ژیانی ئینسان تەفسیری قورئان کە شەش بەرگەو هەموو بەرگەکانی بڵاوکراوەتەوە ئەو پەرتووکەی لەساڵی ١٩٣٠ داناوە بەیەکەم تەرجەمەو تەفسیری قورئانی پیرۆز دادەندرێ لە کوردیدا. وە لەلایەن زۆربەی مەلایانی کاتی خۆی پەسندکراوە.

٢- پرشنگی ڕۆژی کوردەواری لەشەرحی بوخاری کە ئەوەشیان دەبەرگە ئەوێ بەردەستتان بەرگی شەشەمە لەم پەرتووکە کە شەرحی حەدیثەکانی بوخاریە بەکوردی.

٣- دیوانی هەڵبەست بەناوی (دیوانی فانی) لەساڵی ١٩٨٤ بڵاوکراوەتەوە.

٤- تەرجەمەی قەصیدەی بوردیە بەکوردی لەسەر هەمان کێش و سەروا لەساڵی ١٩٨٥ بڵاوکرایەوە ئەو پەرتووکانەی سەرەوەم هەموو بەچاپ گەیاندووە ئەو پەرتووکانەی کە هێشتا بەچاپ نەگەیەنراون ئەمانەی خوارەوەن:

١- حقائق الخیام: تەرجەمەی شیعرەکانی (خەیام)ە بەزمانی عەرەبی.
٢- شەرحی جامع الصغیر بەکوردی کە سێ بەرگە.
٣- شەرحی ذات الشفا بەکوردی.
٤- شەریعەتی ئیسلام لەچوار مەزهەب بەکوردی.
٥- شەرحی لەمەعات بەعەرەبی.
٦- المنظوم فی العقود کە بریتی‌یە لە (٧٨٧) دێڕ هەڵبەست بە زمانی عەرەبی کە باسی فقهی شافعی دەکا.

وە لەبەرواری ١٩٨٣/١٢/١١ لەشاری هەولێر ئەو زانایە کۆچی دوایی کرد.

**بشیرحسین سعدی**
بڵاوکەرەوەو کوڕی دانەر

# كتاب الشروط

## باسی مەرجەکان

شروط جەمعە بۆ شەرط. تەعریفی شەرطیش ئەمەیە لازم بی لەکن عەدەمی عەدەم یەعنی لەنەبوونی مەرج (شەرط) نەبوونی مشروط. شرقاوی لە ج(٢) ص(٢٧٥) ئەگەرچی لەویّ باش دیارکراوە بەلاّم من لەبەر اختصار و کورت کردنەوە اکتفام بەم مقدارە کرد.

**٦٩٦: عن عَقَبة بن عامرٍ (ض) أَحَقُّ الشروط أن توفوا به ما استحللتم به الفروجَ.**

## تەرجەمە

٦٩٦: دەگێڕنەوە لە عەقەبەی کوڕی عامری جهنی ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی لایق ترین و باشترینی شەرت بۆ بەجێ گەیاندنی یان ئەو شەرتەیە کە بەو حەلال دەکەن لەخۆتان عەورەتەکانی ئافرەتان لەمارەکردنیان کە مارەیی‌یە (لە عەینی وا دەلێ) ئیمامی نەوەوی گوتیتی ئیمامی شافعی فەرموویتی لەگەڵ بەشی زۆری زانایان ئەمە مەحموله لەسەر ئەم مەرجانە کە لەگەڵ مقتضای عەقد منافی نین. بەلکی لەمقاصدی عەقد بن. وەکوو دانانی مەرجی باش جوولانەوە لەگەڵ ئافرەت لە عەقدی نکاح یان دانانی مەرجی بەدی هینانی شوین و خواردن و پۆشاک بۆ ئافرەت. بەلاّم مەرجێک کەمنافی مقتضای (واتا لەگەڵ مەبەستی ژن مارەکردن نەگونجێ) عەقد بی/ وەکوو مەرجەک دابنێ کە نزیکی ئافرەتەکە نەکەوێ یاخۆ بەعەدالەت لەگەڵی نەجوولێتەوەو ئەم تەرزە مەرجانە واجب نی‌یە بەجێ گەیاندنیان بەلکی ئەم مەرجانە باطلن واتە ڕاست نی‌یە و کاری پێ ناکرێ. صحەتی نکاحەکەش بە مهر المثل دەبی(١). بەلاّم لای امامی احمد هەموو مەرجێک واجبە لەبەر حەدیثی احق الشروط..الخ. هەندێ لە علما استدلالیان کردووە بەم حەدیثە. ئەگەر ولی- واتە ئەو کەسەی ولی ژنەکەیە وەکوو باوک شتێکی بۆ خۆی گیرا بەشەرط غەیری صداق (واتە مارەیی) کە پەیوەندی بەئافرەتەکەوە هەبێ واجب دەبی لەسەر مێرد بەجێی بگەینی چونکە ئەویش لەو شروطەیە کە استحلالی فەرجی پێ

---

(١) مهر المثل: ئەم مارەیی‌یە کە بۆ ئافرەت دادەندرێ بەگوێرەی مارەیی خوشکی یان پلکی یان کەس و کاری ئەگەر مارەیی‌یەکە لە کاتی مارەکردن دیار نەکرابوو.

کراوه (واته چوونه لای ئافرەتی پێ حەلال کراوه). بەلام لای هەندێ زانایان بۆ ژنەکەیە لای هەندێ زانایانی تریش بۆ وەلی‌یە. «ئەمە عامێکی مەخصوصە لەبەر خروجی شروطی فاسدە» (واتە ئەمەیان شتێکی گشتی‌یە بەلام تایبەتە لەبەر دەرچوونی مەرجی خراپە هەر عەقدێک لەئەنواعی مبایعات ئەگەر شرطێکی داخل کرا بەجێ گەیاندنی واجبە وەکو نکاح بەلام لەبەر اهتمام بەشەئنی استحلالی فەرج لێرە لەنکاح باس کراوە.

٦٩٧: عَنْ ابي هُرَيرة وزيد ابن خـالد (رضيَ اللّهُ عَنْهُمـا) قُل والذي نفسي بيده لأقضِيَنَّ بَيْنكُما بكِتابِ اللّهِ الوَليدَةُ والغَنمُ رَدٌ عَلَيْكَ. وعلى ابنِكَ جَلْدُ مائة وتَغْريبُ عامٍ. أُغْدُ يا أُنَيسُ الى امرأةِ هذا فأن اعترفَتْ فارجُمْها.

## تەرجەمە

٦٩٧: دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە وە زەیدی کوڕی خالدی جوهنی ڕەزای خودایان لێ بی گوتیان یەکێک لەعەرەبەکانی بیابان نشین پیاوێکی لەگەلدا بوو هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا لەسەر فەرموودەی خودا لەقورئان شەرعی من و ئەم پیاوە بکە ئەوی لەگەلی هاتبوو لەو زاناتر بوو گوتی بەلێ بەفەرموودەی کتابی خودا حوکممان لەبەین بکە «یەعنی بەفەرموودەیێکی مطلقە نەک مصرەحە چونکی دوورخستنەوەی ئەوکەسەی زینا دەکا ڕەجم لە قورئان نی‌یە. غەیری ئەمەندە نەبێ نازیل (الشيخ والشيخة اذا زنيا فارجموهما البتَّةَ نَكالاً مِنَ اللّهِ. لەقورئانیش دەخوێنرا لەپاشان تلاوەت و خوێندنەوەی لەقورئان نەسخ کرا. بەلام حوکمی چونکی باقی مایەوە پێغەمبەر (د) حوکمی پێ کرد بەم تەرزە بەعەرەبەکەی گوت» بلێ: یەعنی قسە بکە عەرەبەکە گوتی ئەی پێغەمبەری خودا کوڕی من ڕەنجبەری ئەم پیاوە بوو. زیناشی کردوە لەگەل ژنەکەی. خەبەریشم پێدرا کە لەسەر کوڕەکەم ڕەجم هەیە. منیش بەوەجهی مصالحە سەد مەرو کچێکم داوە بۆ نەجاتی کوڕەکەم ڕەجم نەکرێ ئیستاش پرسیارم کردووە لە زانایان (واتە لەزانایانی ئەهلی فەتوای زەمانی سەعادەتی کە چوار خولەفاو عبدالرحمن کوڕی عەوف و سێ کەسیش لەئەنصاری ئەوانیش ئوبەی کوڕی کەعب و معاذی کوڕی جەبەل و زیدی کوڕی ثابت بوون» کە ڕەجم لەسەر کوڕی من نی‌یە چونکی ژنی نەهێناوە بەلکی هەر سەد جەلدەی لەسەرە لەگەل دوورخستنەوەی لەو شارەی زینای تیاکردووە تا ماوەی - کە نوێژی قەصری تیا دروست بێ. یاخۆ زیاتر.

ڕەجم لەسەر ئافرەتەکە هەیە چونکی شووی کردووە. ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی

سوێند بەو کەسەی کە ڕوحی منی بەدەستە بەکتابی خودا کە قورئان بووە لەپێش ئەوەی خوێندنی لە قورئان نەسخ بکرێ حوکمتان لەبەینی دەکەم کچەکە و سەد مەڕەکە بۆ تو ڕەد دەکرێتەوە بە وجوبی. لەسەر کوڕەکەشت سەد جەلدە هەیە ئەگەر اعتراف بکا (چونکی اقراری باوک لە دژی کوڕەکە قبول ناکرێ». وە دوورخستنەوەشی لەسەر هەیە بۆ ماوەی سالێک فەرمانیشی کرد بە یەکێک لەگەورەکانی ئەصحاب کە ئەویش (ئەنیسی کوڕی ضحاکی سەلەمی-بوو.

فەرمووی بڕۆ لای ژنی ئەم پیاوە ئەگەر اعترافی کرد بەزینای خۆی یا بە چوار شاهێد بەدیارکەوت زینای کردووە ڕەجمی بکە چونکە مێردی هەیە. پێغەمبەر (د) بۆیێ ئەنیسی تەخصیص کرد بەم حوکمە چونکی لەعەشیرەتی ژنەکە بوو پێیان خۆش نەبوو یەکێک حوکمیان بکا لەعەشیرەتی خۆیان نەبێ. ئینجا ژنەکە ڕەجم کرا.

**٦٩٨: عن إبن عمر (ض) عن عُمَرَ نُقِرُّكُمْ ما اقرَّكُمْ اللّهُ قالَهُ بِهودِ خَيْبَرَ. وقالَ لِاحَدِ بَنِي الحُقَيْقِ. كَيْفَ بِكَ إذا أُخْرِجْتَ مِن خيبَرَ تَعدو بِكَ قُلوصُكَ ليلَةً بعدَ ليلَةٍ.**

## تەرجەمە

٦٩٨: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو عومەر کوڕی خۆی کە عبدالله بوو نارد بۆ دابەش کردنی وارداتی خەیبەر لەکشتوکاڵ و خورما ناردیە خەیبەر. شەوێک لەخەودا عبداللەیان لەسەریان فڕەدا خوارێ دەست و قاچی لە جمگە چوو. حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی لەمەدینە بەدواندەر (خَطیب) چووە سەر مینبەر گوتی بەڕاستی پێغەمبەر (د) لەپاش گرتنی خەیبەر خەڵکی خەیبەری لەسەر جێگاو شوێنی خۆی دامەزراندبۆوە کە بە موزارەعە- ئەملاکی خەیبەر بەناو بێن نیوەی مەحصولات بۆ اسلام بوو نیوەشی بۆ ئەوان بەم تەرزە فەرمووی «ئەوەندەی خودا دای مەزراندبن ئێمەش داتان دەمەزرێنین» ئێستاش عبدالله کوڕی عومەر بۆ بەشە ماڵی ئیسلام کە نیوەی وارداتە من ناردم بۆ خەیبەر. لەخەودا بەشەو زولمیان لێ کردووە دەستو قاچی لە جمگە چووە خوار بووینە. ئینجا ڕەئیم لەسەر ئەمەیە دەریان بکەم لەشوێن و نیشتمانی خۆیان ئنجا جوولەکە وەکوو تێ گەیشتن عەزمی حەزرەتی عومەر بۆ دەرکردنی ئەهلی خەیبەر- دوا بڕیاریارە هەر دەریان دەکا. یەکێک لە سەرۆکەکانی بەنی حوقیق هاتە خدمەتی گوتی ئەی گەورەی موسولمانان ئەرێ تۆ بەڕاستیتە ئێمە دەردەکەی کە پێغەمبەریش (د) ئێمەی لەجێگای خۆی دامەزراندوەتەوە کە بە موزارەعە مولکەکان بەناو

بینین. بۆ ئێمەی شەرت کردووە بەم نەوعە حەزرەتی عومەر رەزای خودای لێ بی. گوتی ئەرێ تۆ واتێ دەگەی من لەبیرم چووە قسەی پێغەمبەر (د) وەکوو بەتۆی گوت. ئایا چلۆن دەبی ئەحوالت وەکوو دەرکرای لە خەیبەر بەووشتری خۆش بەزت غاردەدەی شەو لەپاش شەو: گوتی ئەمە لەلایەن ابو القاسم گالتەیەک بوو لەگەڵ من حەزرەتی عومەر فەرمووی درۆ دەکەی ئەی دوژمنی خودا: ئنجا حەزرەتی عومەر دەری کردن لەخەیبەر لەجیاتی بەر میوەی ئەوساڵە مالی پێ دان لەووشترو مردەماڵ وەکوو کورتانە ووشترو بەتکو شتی تریش.

(ش) ئنجا ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (د) بەرەئیسی حوقەیق کەپێ گوت: ئایا چلۆن دەبی ئەحوالت وەکوو دەرکرای لەخەیبەر. لەژیانی سعادەتی خۆی بوو بە معجزە و اخبار بەغەیب. حەزرەتی عومەریش کە لەتۆڵەی لەجۆمگەچوونی دەست و قاچی عبدالله داوای تۆڵەی لێ نەکردن. چونکی بەشەو لەخەودا ئەم زولمەیان لە عەبدالله کردبوو نەزانرا کێ لەبان فرەیداوەتە خوارێ.

٦٩٩: «شروط حديبية»

**مەرجەکانی حودەیبیە**

مِنَ المسوَرِ ابن مخْرمَةَ (رضي الله عنهما». إنّ خـالِدَ ابنَ الوليد بالغَميم في خَيلٍ لِقُرَيْشٍ طَليعَةٌ فخُذوا ذاتَ اليَمين. ماخَلاتِ القَصواءُ وَ ماذاك لَها بخُلُقٍ ولكنْ حَبَسها حابسُ الفيلِ والذي نفسي بيده لايَسئلوني خُطَّةً يعظِّمونَ فيها حُرُمات الله الا اَعْطَيتُهُمْ إيّاها. إنّا لمْ نَجئْ لقتال احَدٍ ولكنّا جئنا معتمرين وَإنّ قريشاً قد نُهَكَتهم الحَرْب وَاَضرَّت بهمْ فأن شاءوا مادَدْتهُم مُدَّةً ويُخلّوا بَيْني وَبيْنَ النّاس فانْ اظهَر فان شاءوا انْ يَدْخُلوا فيما دَخَل فيهِ الناسُ فعَلوا وَإلاّ فَقَد جَمّوا وَإنْ هُمْ ابَوا فوَالذي نَفْسي بيَدِهِ لاقاتِلنّهم على اَمْري هذا حتّى تنفرِد سالفتي وَ ليُنَفِذَنَّ اللّهُ امرَهُ. امّا الأسلام فاقبلُ وَامّا المالُ فلستُ مِنْهُ في شئ... هذا فِلانٌ وَهوَ مِن قَوم يُعَظِّمونَ البُدْنَ فابْعَثوها لهُ. هذا مكْرَزٌ وَهو رَجُلٌ فاجرٌ. إذا جاءَ سُهَيْلٌ قالَ قد سَهُلَ لكمُ مِن اَمْرِكمُ. فقالَ اكتُبْ بَيْننا وَبَينكُم كِتاباً فقال النبي (ص). اكتب بسم الله الرحمن الرَّحيم اكتب باسمكَ اللهُمَّ هذا ماقاضى عَلَيْهِ محمدٌ رسول الله واللهِ إنّي لرسولُ اللهَ وإن كذبتُموني اكتب محمد ابن عبدالله على انْ تُخَلّوا بَيْننا وَبَيْنَ البيَت فنطوفُ به. إنّا لَمْ نقضِ الكتابَ بعدُ فأجزهُ لي. بلى فافعَلْ بلى بلى إنيّ رسولُ اللهَ وَلَسْتُ اَعْصيه وهو

ناصِرِي بَلى فأخبرتُكَ انّا نَأتيه العامَ. قال فانك اتيهِ وَمطوّفٌ به. قوموا فانحروا ثمّ احلقوا ثلاث مَرّاتٍ لقد راى هذا ذُعْراً. فجاءَ ابو بصيرٍ. قال النبي صلى الله عليه وسلم وَيْلُ امّهِ مِسعَرُ حَرْبٍ لو كان لَه أحدٌ.

## مەرجەکانی حودەیبە

دەگێڕنەوە لە میسوەری کوڕی مەخرەمە- ڕەزای خودایان لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەیەکەم ڕۆژی ذی القعدە کە ڕۆژی دووشەم بوو لەساڵی شەشەمی کۆچی. بەهەزارو چەند کەسێک لەئەصحاب لە مدینەوە بۆ زیارەتی بیت ڕوو بە مەکە تەشریفی فەرموو. هەتا هاتە ذو الحليفه لەوێ احرامی بە عمرە بەست بو سرای کوڕی سوفیانیشی نارد بە جاسوس بو استکشافی خەبەری قوڕەیش. هەتا لەکاتی ڕۆیشتن لەهەندێکی ڕێگا پێغەمبەر (د) فەمووی خالدی کوری وەلید کە سەرۆکی پێش لەشکری عەسکەری قوڕەیش بوو بە (غەمیمە) کە جێگایەکە لەنزیکی مەکە لەبەینی رابغ و جوحفە بەخۆیو دووسەد سواری قورەیش بۆ کەشفی ئەحوالی ئێمە ئنجا ئێوە دەستەراست بگرن غەیری ئەوٛ ڕێگایە کە خالد دەیویست سوێند بەخودا هیچ ئاگای لەخۆی نەبوو هەتا لەناکاو چاوی بەتۆزی لەشکری ئەصحاب کەوت هیچی تری پێ نەما ئەمەندە نەبێ. ڕوو بەمەکە ئەسپی تاودا. بۆ تەبلیغی هاتنی پێغەمبەر (د) بەقوڕەیش پێغەمبەریش (د) ڕۆیشت هەتا گەیشتە (ثەنیە) کە بۆ سەر قورەیش شۆڕ دەبیتەوە. لەوێ ووشتری پێغەمبەر کەناوی (قەصوا) بوو یخ بوو چۆکیدا هەرچەند ئەوانەی لەوێ بوون تێیان ڕاخوڕی بە قسەی خۆیان گوتیان -حەل-حەل- هەتا هەلبستی بەهیچ جۆر لەجێگای خۆی نەجولا ئەصحاب گوتیان - خلات القصوا- واتە قەصوی سەر ڕەق بووە. پێغەمبەر (د) فەرمووی قەصوا سەر ڕەق نی‌یە هەتا نیستا ڕەووشتی ئەو سەر ڕەقی نەبووە. بەلکی ئەو کەسی کە فیلی قەدەغەکرد لەمەکە قەصواشی مەنع کرد لەڕۆیشتن پاشان فەرمووی سوێندم بەو زاتەی کە ڕوحی منی بەدەستە هەرچی داوام لێ بکەن کە ڕێزگرتنی بەیتی تیا هەبی و ببتە هۆی ئەمن و ئاسایش و ببتە هۆی نەبونی شەڕکردن لەحەرەمی بەیت پێیان دەدەم پاشان بەزاتی مبارەکی خۆی قەصوای زەجرکرد ڕاست بۆوە. ئنجا لە قوڕەیشی لادا بۆ سەرەوەی حودەیبە هات لە جێگایەک دابەزی کەمێکی ئاو هەبوو. ئەصحابەکانی پێغەمبەر کەم کەمە بەگۆلم لەئاوەکە سوودیان وەردەگرت هەتا ئاو تەواو بوو. شکایەتی تینوبوونی خۆیان و کەمَ ئاوی بیرەکەیان (کەناوی ئەمەد بوو) بردە خدمەت پێغەمبەر (د) ئنجا لەتیرداني پیرۆزی خۆی تیرێکی دەرهینا ئەمری پێ کردن. ئەم تیرە لەناو بیرەکە دانێن. سوێند بەخودا وەکوو

تیرەکەیان لەبیرەکە دانا لەبنی بیرەکە دەرکولینی ئاو جۆشی خوارد هەتا بەغایەتێک لەپاش پڕبوونی بیرەکە. ئەصحاب بەقاپ و قاپچاغ ئاویان لەزاری بیر دەبرد لەم حەو دابوون. لەناکاو بودەیلی کوڕی وەرقای خوزاعی کەسینەی ئەوان ڕازەکانی پێغەمبەری تێ دەشاردراوەو مەحرەمی ئەسراری ئەو بوون صەحابەیەکی گەورەبوو بەخۆی و بەجەماعەتێک لەبەنی خوزاعەی قەومی خۆی وەکوو عەمری کوڕی سالم و حەڕاشی کوڕی ئومەیە خارجەی کوڕی کەرزو بەرپەرەی کوڕی ئومەیە کە خەلکی توهامە بوون یەعنی خەلکی مەکەو دەوروپشتی مەکە بوون. ئنجا بودەیل گوتی من کەعبی کوڕی لۆی و عامری کوڕی لۆی م دیتن لەسەر ئاوە زۆرەکانی حودەیبە دابەزیبوون چەند ووشتری تازە زاویان لەگەڵ بێ چەند ووشتری بەبێچووی گەورەیان لەگەڵ بوو بۆ شیرو دۆ بەم فکرەیان کوشتار لەگەڵ تۆ بکەن نەت هێلن بچی‌یە کەعبە.

«ش» لە قسەی بودەیلی کوڕی وەرقا بەدیارکەوت کە حودەیبە ئاوی زۆر بووە لەپێش هاتنی ئەصحابان کافرەکانی مەکە لێ دابەزیبوون ئاوەکەیان ووشک کردبوو بەخۆیان و ووشترو مالاتیان» پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێمە نەهاتوین کوشتار لەگەڵ هیچ کەس بکەین ئێمە احرامان بەنیەتی عومرە بەستووە بۆ طەواف و سەعی و حەلق عومرەی خۆمان تەواو دەکەین وە دەگەڕێینەوە لەگەڵ ئەوەش بەڕاستی هێزی مادی و مەعنەوی قورەیشی‌یەکان لەبەر شەڕی زۆریان بەتەواوی شکابوو. (واتە لەشەڕی بەدر و لەشەڕی خەندەق جێگایانی تریش زۆر زیانیان دیتبوو). ئنجا ئەگەر حەزدەکەن پەیمانەکی کاتی (مۆقت) لەبەینی خۆم و ئەوان دادەنێم واز لەبەینی من و خەلکی دی بێنن. ئنجا ئەگەر سەرکەوتن بە من درا لەسەر خەلکی ئەگەر حەزیان کرد بائەوانیش وەکوو خەلکی تر بێنە ژێر فەرمان و طاعەتی من وە ئەگەر نەشهاتنە ژێر طاعەتی من سویندم بەو زاتەی کە ڕۆحی منی بەدەستە کوشتاریان لەگەڵ دەکەم لەسەر ئەم دینەی خۆم هەتا دەمرم وە بەبێ شکیش خودای گەورە فەرمانی خۆی بەجێ دەگەینی لە نەصرەت و سەرخستنی دینی خۆی. بودەیل گوتی ئەم قسەی کە تۆ فەرمووت دەچم بە قورەیشی ڕادەگەیەنم. بودەیل ڕۆیی تا چووە لای قورەیش گوتی من لەلایەن ئەم پیاوە کە پێغەمبەرە هاتوومە لای ئێوە هەندێ قسەم لێ بیستووە ئەگەر ڕاتان لێیە بۆتان دەگێڕمەوە. بێ عەقلەکانیان گوتیان ئێمە موحتاج نین قسەی ئەو بۆ ئێمە بگێڕی‌یەوە. خاوەن ڕایەکانیشیان گوتیان بیگێڕەوە هەرچی لێت بیستووە. بودەیل فەرمایشاتی پێغەمبەری بەتەواوی بۆ گێڕانەوە. عوروەی کوڕی مەسعودی موعەیتبی ثەقەفی ڕووی قسەکردنی لە قورەیش کرد گوتی ئەرێ ئێوە بۆ من باوک نین دەربارەی بەزەیی و (شەفەقەت) گوتیان با ئەدی منیش وەکوو کوڕی ئێوە

نیم بۆ ئێوە دەربارەی پاراستنی ماف و حەقەکانتان. گوتیان با. گوتی ئەدی نسبەتی توهمە بۆ خیانەت بەمن دەدرێ. گوتیان (نا) گوتی ئەدی ئێوە بەئەهلی عەکاظم گوت بۆ من وەرنە مەیدان داوام لێ کردن بێن شەریان لەگەڵ بکەم نەیان توانی بێنە مەیدانی من. منیش بەخزم و خێزانی خۆم هاتمە لای ئێوە گوتیان بەڵێ. گوتی ئەم پیاوە واتە (پێغەمبەر) لەقسەکانی خۆی خەصلەتێکی ڕوو لەمەصلەحەتی بۆ ئێوە دیارکردووە. قبوول بکەن وازیش لەمن بێنن من بچمە لای. گوتیان بچۆ لای وەکو بە خدمەت پێغەمبەر گەیشت پێغەمبەر (د) عەینی قسەکانی بودەیلی کە بۆ قورەیشی گێڕابۆوە بەعروەشی گوت عوروە گوتی ئەی محمد تۆ پێم بلێ لەهیچ کەسێکت بیستووە لەعەرەب هەموو قەومی خۆی بەهیلاکدابی ئەگەر دامان نا تۆ سەرکەوتی. وە ئەگەر سەریش نەکەوتی بزر نی‌یە چیت بەسەر دێن ئەصحابی تۆ کەلکی‌یان بۆ تۆ نابی سوێندم بەخودا من دەبینم لەشکرەکەی تۆ پێک هاتووە لە خەلکی پەڕاگەندە. لەشکرێکی واش بی یەک عەشیرەت و یەک ڕەنگ نەبی لەوانەیە لەشەڕدا هەلبێ. پاشان بەتەنیا دەمێنی‌یەوە: حەزرەتی ئەبوو بەکر گوتی تۆ گیلکەی کوسی لات بمژە «اي عُض بُظرٌ فرج اللّاتِ» ئایا ئێمە فیرار دەکەین و پێغەمبەر جێ دەهێلین؟ عوروە گوتی ئەمە کێ‌یە گوتیان ئەبو بەکرە. عوروە گوتی بەحەقی ئەو زاتەی کە رووحی منی بەدەستە ئەگەر لەبەر ئەمە نەبا کە زۆر چاکەت لەسەرم هەیە وەلامم دەدایەوە. ئنجا عوروە رووی قسەکردنی لە پێغەمبەر کردەوە هەر جارەکی قسەیەکی دەکرد دەستێکی بۆ ریشی پیرۆزی پێغەمبەر دەبرد موغەیرەی کوڕی شوعبەش بۆ پاراستنی پێغەمبەر بەشیری خۆیەوە لەسەر سەری پێغەمبەر ڕاوەستابوو. هەرجارە کەدەستی بۆ ریشی پێغەمبەر دەهینا بەقونکی کالانی شیر کە قونکی لەزیو گیرابوو لەدەستی دەدا. پێ‌ی دەگوت دەستت بکێشەوە لەڕیشی پێغەمبەر. عوروە سەری بلند کرد گوتی ئەمە کێ‌یە گوتیان موغیرەی کوڕی شوعبەیە برازایەکەی خۆتە. عروە گوتی هەی غەددار ئەوە من نەبووم بو ئەوەی شەڕت تووش نەبی لەئەنجامی خیانەتی تۆ چەند لەبۆت ماندوو بووم و چەند هەولم دا. چونکی موغیرە لەزەمانی جاهیلیەت لەگەڵ سێزدە کەس لەثەقیف بۆ مصر بۆ لای مقوقەس دەچوون لەڕێگا بووە عەداوەت و دوژمنایەتی لەگەلیان لەحالی سەر خۆشیاندا هەموویانی کوشت مالەکانیشی هەموو هینا بۆ مەدینە لای پێغەمبەر (د) موسولمان بوو. پێغەمبەر (د) بە موغیرەی گوت دەربارەی موسولمان بوونت من قبوولم کردی. بەلام دەربارەی ماڵ من لەهیچ دانیم یەعنی تۆ بەغەدر هاوڕێکانی خۆت کوشتووە. ئەسپ و چەکیشت هێناون من ئەوە قبوول ناکەم و ڕاست نی‌یە چونکی مالی کافران ئەگەرچی لەزەمانی شەڕ حەلالە بەلام لەزەمانی ئاشتی ئەم هەموو کوشتن و تالانە

حەرامە. لەپاشان (عروە) بەتەواوی بیرکردنەوەو دقەت تەماشای گەورەیی و ڕێزگرتنی ئەصحابی دەکرد. دەرحەق بە پێغەمبەر (د) بەم تەرزە گوتی والله پێغەمبەر (د) تفێکی فڕەنەدەدا یاخۆ بەلغەمێکی فڕە نەدەدا الامەگەر ئەو تف و بەلغەمە دەبایە بکەویتە ناو دەستی یەکێک لەئەصحابی پاشان لەڕوویی خۆیان و جەسەدی خۆیان هەڵدەسوی وە ئەگەر فەرمانێکی پێ بکردبانایە بە زوویی بۆ بەجێ گەیاندنی فەرمانەکە سەعیان دەکرد. وە ئەگەر دەست نوێژی بشوشتبایە نزیک بوو کوشتار بکەن لەسەر ئەو پشکە ئاوەی کە لەجەسەدی ئەو دەهاتە خوارێ. وە ئەگەر بەئامادەبوونی ئەو قسەشیان بکردایە بەزوویی بۆ بەجێ گەیاندنی هەولیان دەدا لەبەر رعایەتی ئەدەب و خضوع بەدەنگی نەرم و بەدزی قسەیان دەکرد وە لەبەر بەگەورە زانینیان و مەهابەتی ئەم زاتە گەورەیە. بەلێ بەووردبوونەوە تەماشای دەم و چاویان نەدەکرد. هەروەکو تەیر لەسەر سەریان نیشتبی بۆ ئەوەی نەوەکوو بفڕی هەرکەس تەماشای پێش خۆی دەکرد و سەری بلند نەدەکرد. ئنجا عروە گەڕاوە بۆ لای ڕەفیقەکانی خۆی گوتی ئەی قەوم بەخودا من بەوەفد بۆلای زۆر مەلیک و پاشایان چوویمە. بۆلای قەیصەر قەڕالی ڕۆم چوویمە بۆلای کسری شای عەجەم چوویمە بۆلای نەجاشی پاشای حەبەشە چوویمە ئەو بەگەورەگرتن و ڕێزلینانەی کەلای ئەصحابی محمدم چاو پێکەوت دەرحەق بە محمد لەخەدەم و حەشەمی هیچ پاشایەکم چاو پێ نەکەوتووە دەرحەق بە سەرۆکی خۆیان. ئنجا دەربارەی ڕێزگرتن و بەگەورەزانین بەتەواوی هەمووی بۆ گێڕانەوە وە لەسەر تەرتیبی نووسینەوەمان. وە ئەم زاتەش خوطەیێکی ڕوو لە مەصلەحەت ڕەوشتێکی بەخێرو چاکەو بەکەلکی بۆ ئێوە دیار دەکا ئنجا قبوول بکەن. پاشان پیاوێک لەبەنی کنانە ناوی (حولەیسی کوڕی عەلقەمەبوو) گوتی لێم گەڕێن من دەچمە لای. گوتیان بچۆ وەکو لە پێغەمبەر (د) بەدیارکەوت. فەرمووی ئەمە (حولەیسە) سەرۆکی قەومی کنانەیە هەدی و قوربانی ووشتریان زۆر لا گەورەیە. ووشترەکانی قوربانی نیشان بدەن ووشترەکانیان بۆ پێش بردو بەلبیک اللهم لبیک هەموویان نیشان دا و پێش وازیان کرد. حولەیس وەکوو چاوی بەو حاڵە کەوت گوتی (سبحان الله) لەوە ناوەشێنەوە ئەوانە قەدەغە بکرێن لەبەیت. وەکوو گەڕاوە لای قوڕەیش و ڕەفیقەکانی لەپاش گفتوگۆیەکی زۆر لەگەڵ پێغەمبەر (د) گوتی ئەمانە بەنیەتی تمتع بە عومرە هاتوونە ووشترێکی زۆریان نیشانە دارکردوە بۆ هەدی و کوشتنەوە لە حەرەم. بەم تەرزە خەناوکەیان لەمل کردوونە وەکەمێک دونگیان بەخوێن هێناوون گوتیان ئەی حولەیس تۆ واز لەئێمە بێنە. ئێمە بە هەوەسی خۆمان دەکەین. لەپاشان پیاوێکی غەددارو درۆزن گوتی لێم گەڕێن من بچمە لای ناوی مکرزی کوڕی

حفص بوو وەکو لە اصحاب بەدیارکەوت پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەمە -میکرەزە پیاوێکی خراپە. قسەی لەگەڵ پێغەمبەر دەکرد. دیتی‌یان سوهەیلی کوڕی عەمر هات پێغەمبەر (د) بە موتفأل بەناوی سوهەیل فەرمووی بێ شک ئیشتان بۆ سەهل و ئاسان بوو سوهەیل گوتی بێنە کاغەز لەبەینی ئێمەو خۆت بنووسە پێغەمبەر فەرمانی بە حەزرەتی عەلی کرد کاغەز بنووسی فەرمووی بنووسە/بسم الله الرحمن الرحیم- سوهەیل گوتی من نازانم رحمان چی‌یە ڕازی نیم وابنووسی بنووسە باسمک اللهم وەکوو لەسەرەتای پێغەمبەرایەتیت لەسەر عادەتی پێشی پێغەمبەرایەتیت وات دەنووسی ئەصحابەکانی بەڕێزی پێغەمبەر سوێندیان خوارد ئەم عبارەتە قورئانیە نەبی نانووسین. پێغەمبەر فەرمووی بنووسە باسمک اللهم زەرەری نی‌یە پاشان بنووسە ئەمە ئەو حوکمەیە پێغەمبەری خودا کردی سوهەیل گوتی والله ئەگەر ئێمە بمان زانیایە تۆ پێغەمبەری خودای تۆمان قەدەغە نەدەکرد لەبەیت وە کوشتاریشمان لەگەڵ نەدەکردی بەلام بنووسە ئەمە حوکم و معاهدەی محمدی کوڕی عبداللەیە پێغەمبەر (د) فەرمووی والله بەحەقی خودا بەڕاستی وە بەبێ شک من پێغەمبەری خودام وە کوڕی عبداللەشم بەلام ئەگەر پێشم باوڕ ناکەن بنووسە محمد کوڕی عبدالله. بەلام یەکەمین مەرج ئەمەبێ واز لەبەینی ئێمەو بەیت بێنن بۆ خۆمان طەوافی بکەین وە زیارەتی بکەین- سوهەیل گوتی والله ئێمە قبول ناکەین تۆ ئیستا بێ‌یە کەعبە طەواف بکەی. وە عەرەبیش بلێن محمد بەزۆر بێ ئەوەی قوڕەیش پی یان خۆش بی کەعبەی زیارەت کرد بەلام- ئەم زیارەتەی تۆ بۆ بەیت بمینێ بۆ سالێکی تر. ئەمە نووسرا. پاشان سوهەیل گوتی- پێک هاتنەکەمان لەسەر ئەمەیش بێ یەک پیاوی ئێمە نێتە لای تۆ با لەسەر دینی تۆش بێ. ئەگەر هات دەبی بیگێڕی‌یەوە بۆ ئێمە ئەصحاب بەجواب هاتن گوتیان سبحان الله چلۆن بۆ ناو کافران ڕەد دەکرێتەوە ئەمە موسولمان بووە بۆیی هاتووتە ناو ئیسلام لەم قسانەدا بوون دیتی‌یان کوڕی نەفسی سوهەیلی کوڕی عەمر ناوی عاص بوو بەلام بەناوبانگ بوو بە ابو جندلی کوڕی سوهەیل بەقاچەکانی زنجیرکراوی لەبەندیخانە لەمەکەوە بەدزی خۆی خستە ناو عەسکەری ئیسلام چونکی ئەبو جندلی کوڕی سوهەیل لەمەککە بوو بەلام لەمێژ بوو موسولمان بووبوو سوهەیل وەکوو چاوی بەکوڕەکەی خۆی کەوت کە بەڕاکردن هاتوتە ناو ئیسلام گوتی یا محمد یەکەم مەرجم ئەوەیە کە ئەم کوڕەی من بگیری‌یەوە. پێغەمبەر (د) فەرمووی هێشتا کاغەزی معاهدەو پەیمانمان مۆر نەکردووە یەعنی هەتا ئیمزا نەکرێ ئەوەی لەپەیمانەکە نووسراوە جێ‌بەجێ کردنی واجب نابێ» سوهەیل گوتی والله کەواتە من مصالەحەت لەگەڵ ناکەم لەسەر هیچ شتێک ببڕای ببڕای پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەمە بۆ من اجازە و روخصت بدە

سوهەیل گوتی بۆ تۆش اجازەو روخصەت نادەم پێغەمبەر (د) دووبارە فەرمووی حەزدەکەم بەمنی ببەخشی گوتی ئەبەدەن اجازە نادەم میکرزی پیاو خراپ کە لەگەڵ سوهەیل هاتبوو بۆ پێک هاتن. بەپێغەمبەری گوت قەیناکا ئەوا بەتۆمان بەخشی. بەڵام پێغەمبەر (د) وەکوو تێگەیشت سوهەیل بۆ گەڕاندنەوەی ابو جندل لەسەر قسەی خۆی زۆر مصرە هیچی تری نەفەرموو. ابو جندل لەقسەکانی تێگەیشت دەی گێڕنەوە بۆ ناو کافران بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد گوتی ئەرێ ئەی عەشیرەتی اسلام من ئەوا بەموسولمانی هاتوومە ناو ئێوە دووبارە من دەنێرنەوە ناو کافران ئێوە قەت نازانن ئەم کافرانە لەحەپسخانە چەند منیان عەزابداوە لەم ڕاکردنەشم چەند ماندووبوێە و ئەزیەتم کێشاوە لەهەمووش مەبەستم تەنیا خودا بووە. ئنجا حەزرەتی عومەر فەرمووی چوومە خدمەت پێغەمبەر (د) پێم گوت. ئەرێ تۆ پێغەمبەرێکی بەحەق نی؟

پێغەمبەر: بەلێ پێغەمبەرێکی بەحەقم.

حەزرەتی عومەر: ئەدی ئێمە لەسەر حەق نین دوژمنیشمان لەسەر ناحەق نی‌یە؟

پێغەمبەر فەرمووی: بەلێ ئێمە لەسەر حەقین دوژمنیشمان لەسەر ناحەقە.

حەزرەتی عومەر: گوتی ئەدی کەوایە ئەم حالەتە دەنیو خەبیشە بۆچی لەدینی خۆمان قبوڵ بکەین.

پێغەمبەر (د) فەرمووی من ناردراوی خودام سەرپێچی ناکەم ئەو یارمەتیم دەدا.

حەزرەتی عومەر: عەرزم کرد ئەرێ تۆ نەت فەرموو ئێمە بۆ مەکە دەچین طەوافی بەیت دەکەین.

پێغەمبەر (د) فەرمووی بەلێ وایە بەڵام بەتۆم گوت ئیمسال دەچین؟

حەزرەتی عومەر: گوتی نا.

پێغەمبەر فەرمووی: موحەقەقت بی تۆ دەچی‌یە مەکە طەوافی دەکەی.

حەزرەتی عومەر فەرمووی بۆلای حەزرەتی ئەبو بەکر چووم گوتم ئەی ئەبو بەکر ئەمە پێغەمبەرێکی بەحەق نی‌یە: ابوبکر گوتی بەلێ پێغەمبەرێکی بەحەقە.

عمر: ئەدی ئێمە حەق نین دوژمنیشمان لەسەر ناحەق نی‌یە؟

ابوبکر: بەلێ ئێمە لەسەر حەقین دوژمنیشمان لەسەر ناحەقە.

عمر: ئەدی بۆچی ئەم خەسلەتە دەنی‌یەو ئەو بێ غیرەتی‌یە لەدینی خۆمان قبوول بکەین وەکوو وای گوت حەزرەتی ئەبوبەکر ڕووی قسەکردنی لە حەزرەتی عومەر کرد پێی گوت: ئەی پیاو ئەمە پێغەمبەری خودایە بێ ئەمری خودای خۆی ناکا خودای ئەو سەرکەوتن و یارمەتی بە ئەو دەدا فەرمانی ئەو بەجێ دەگەیەنی لەفەرمانی ئەو جودا

نابتەوە وەسوێند بەخودا ئەو لەسەر حەقە.
عومەر: ئەدی بەئێمەی نەگوت ئێمە دەچینە مەککە وە طەوافی بەیت دەکەین؟
ئەبو بەکر: بەڵێ بەئێمەی گوت بەڵام بەتۆی گوت ئیمساڵ دەچین؟
عومەر: گوتی نا
ئەبو بەکر: بەبێ شک و گومان مسۆگەرت بێ تۆ دەچیتە بەیت و طەوافیش دەکەی.

حەزرەتی عومەر گوتی لەپاش ئەم گفتوگۆیەم لەگەڵ پێغەمبەر و ئەبو بەکر زۆر پەشیمان بوومەوە. چونکە راوەستام لەبەجێ گەیاندنی فەرمانی پێغەمبەر. لەجەزای ئەمە ساڵێک بەرۆژوو بووم و چەند بەندەم ئازاد کرد لەو ماوەش بەدەوام خەریکی نوێژکردن بووم.

(ش) (ئەمە لەبەر گومان نەبوو لەلایەن حەزرەتی عومەر بەڵکوو مەبەستی تێگەیشتنی حیکمەتی قضیە بوو) ئینجا لەپاش تەواوبوونی کاغەزی موعاهەدە پێغەمبەر(د) فەرمانی بەئەصحاب کرد هەلستن هەدی و قوربانی خۆتان بکوژنەوە وەسەری خۆتان بتراشن لە ئیحرامی عومرە بچوونە دەرێ. ڕاوی دەڵێ واللە بۆ بەجێگەیاندنی ئەم فەرمانە. یەکێک لەئەصحاب لەجێگای خۆی نەجوولا. بەکورتی سێجار وای پێفەرموون قەت یەکێک هەڵنەستا چونکی ئەصحاب ئومێدیان هەبوو کەوەحی بۆ پێغەمبەر بێ صولحی حودەیبە هەڵبوەشێنێتەوە. بەلکی بۆ مەکە دەڕۆن پێیان ناخۆش بوو لەسەر ئەم هەموو عەزم و قوەتە کە لە خۆیان دەدیت لەپاش ئەم هەموو مەسرەف و ماندووبوونە. بەسووک و ئاسانی بێ طەوافی مەککە بگەڕێنەوە مەدینە. وەکوو هیچ کەسێک هەڵنەستا پێغەمبەر(د) چووە لای ئومی سەلەمە. حیکایەتی ئەحوالی خراپی خەڵکی بۆ گێڕانەوە. ئومی سەلەمە گوتی لۆمەیان مەکە. چونکی ئەوان تووشی شتێکی گەورە بوون. لەبەر زەحمەت کێشانی تۆ دەربارەی- صلح- ویشگەڕێنەوە بەبێ گرتنی مەکە بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەگەر حەزدەکەی تووشی سەرپێچی (موخالەفە)ی تۆ نێن. تۆ هەلستە بچۆ دەرێ قسە لەگەڵ هیچ کەسێک مەکە هەتا هەدی و قوربانیەکانی خۆت دەکوژیەوە. وەبانگی دەلاقی خۆت بکە (کە خراشی کوڕی ئومیەی فەضلی خوزاعی کەعبی بوو) سەرت دەتراشی. ئنجا پێغەمبەر(د) لەسەر ئیشارەی ئومی سەلەمە چووە دەرێ قسەی لەگەڵ هیچ کەسێک نەکرد. هەتا ووشترەکانی خۆی کوشتەوە وەسەری خۆی تراشی. وەکوو ئەصحاب ئەمەیان لەپێغەمبەر چاو پێکەوت. بەتالووکە هەلستان هەر کەس ووشتری خۆی کوشتەوە و خۆبەخۆیی سەری یەکتریان تراشی. هەتا بەغایەتێک نزیک بوو هەندێکیان بکوژن. لەغەمی ئەوەی بۆ یەکەم جار قسەی پێغەمبەریان زوو جێبەجێ نەکرد. لەپاشان

چەند ئافرەتێکی ئەهلی مەککە کەلەپێش کۆچ کردنی پێغەمبەر(د) بۆ مەدینە موسولمان ببوون هەر لەمەککە مابوونەوە. بەنیەتی کۆچ کردنیان بۆ مەدینە لەکاتی صلح لەحودەیبیە گەیشتنە ناو عەسکەری ئیسلام ئنجا دەرحەق بەم ئافرەتانە خودای گەورە ئەم ئایەتەی خوارەوەی هەناردە خواری [يا ايها الذينَ آمنوا اذا جاءكم المؤمنات مهاجرات فامتحنوهُنَّ الله اعْلَمُ بأيمانِهِنَّ] یەعنی ئەی ئەوانەی باوەڕیان هیناوە. وەکوو هاتنەلاتان لەناو کافران ئافرەتەکانی کلیمەی شەهادەیان گوتبی سوێندیان بدەن کەتەنیا لەبەر خۆشەویستی ئاینی هاتووینە ناو ئیسلام. خودا زانایە بەباوەڕهینانی ئافرەتەکان [فأن علمتوهنَّ مؤمناتٍ فلا ترجعوهن الى الكفار] ئینجا ئەگەر تێیان گەیشتن ئیماندارن. مەیان گێڕنەوە بۆ ناو کافران [لاهنَّ حِلٌّ لهم ولاهم يحلّونَ لهُنَّ] نە ئافرەتەکان حەلالن بۆ کافران نە کافریش حەلالن بۆ ئافرەتەکان [وَآتوهم ما انفقوا ولاجناحَ عليكم ان تنكحوهُنَّ اذا آتيتموهنَّ أجورَهُنَّ] وە بەمێردەکانی کافریان بدەن. ئەوی صەرفیان کردووە. لە ئافرەتەکانیان وەکوو مارەیی و شتی تریش وە گوناهیش نییە بۆ ئێو مارەیان بکەن وەکوو پێیان بدەن مارەییەکانیان [وَلا تُمسِكوا بعصم الكوافر] وەڕامەگرن ئافرەتەکانی کافر. بەعەقدی خۆیان کە لەزەمانی کافرییان کراوە. پاشان پێغەمبەر(د) گەڕاوە بۆ مەدینە. عوتبەی کوڕی جاریەی ثەقەفی بە نازناوی (کونیەی) [ابو بصير] موسولمان بوو. حەلیفی قوڕەیش بوو. لەمەدینە هاتە خدمەت پێغەبەر(د) گوتیان لەسەر موعاهەدە نامەی خۆت هاتوین پێمان بدەیەوە پێغەمبەریش (ابو بصير)ی دانەوە. پیاوەکان و- ئەبو بەصیر- هاتن هەتا ذوالحليفه. دابەزین هەندێ خورمایان پێبوو بیخۆن. ئەبو بەصیر- بەیەکیکیانی گوت والله ئەی فلان دەبینم شیرەکەی تۆ زۆر باشە پیاوەکە گوتی ئەرێ والله زۆرم تەجرەبە کردووە زۆر باشە شیرەکەشی لەکالان هەڵکێشا ئەبو بەصیر گوتی ئادەی تەماشایەکی بکەم. شیرەکەی لەگەڵ کەوتە دەست ئەبو بەصیر- دایە بەرشیران هەتا لەجێگای خۆی ساردی کردەوە و کوشتی ئەوی تریش ڕایکرد هەتا هاتەوە مەدینە بەغار خۆی لەمزگەوتی پێغەمبەر خزاند پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەمە ترسێکی لەدووە وەکو گەیشتە خدمەت پێغەمبەر(د) گوتی والله ڕەفیقم کوژرا. بێشک منیش کوژراوە ئەمەندەی پێنەچوو ئەبو بصیر گەیشتە ئەوێ. گوتی ئەی پێغەمبەری خودا خودای گەورە تۆی گێڕا بەخاوەنی وەعدی خۆت تۆ منت ڕەدکردەوە بۆ ناو قوڕەیش لەپاشان خودا منی نەجاتدا لەوان پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەی هاوار بۆ دایکی ئەبو بەصیر- خۆشکەری ئاگری شەڕ بوو ئەگەر هیچ کەسی لەپشت هەبوایە «یەعنی حەزی دەکرد صولح و ئاشتیمان لێ تێک بدا». ئەبو بەصیر وەکوو ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەر بیست. زانی دەینێرێتەوە

ناو کـافـران. لەمـەدینە چووە دەرێ هەتا چووە دەم بەحـر. ئەبوو جندلیش لەمـەککە خـۆی لەچەنگ کافرەکانی مەککە قوتارکرد. التحاقی کرد بە ئەبو بەصیر- ئیتر وورده وورده هەر پیاوێک کە لە قورەیش موسولمان دەبوو لەزەمانی هودنە خۆیان دەگەیاندە ئەبو بەصیرو ئەبو جـەندەل. هەتا بوون بە حـەفـتـا کـەس هەمـووی سـوار ئنجـا کـەسب و کـاریان ئەمـەبوو. بیـانبیـسـتـایە قافلەیەکی قـورەیشـی یان دەرچووە بۆ شـام دەهاتنە سەر ڕێگا دەیان کـوشتن و مالـیشیان دەبردن کافرەکانی قـورەیش کەوتتنە تەنگ و چەڵەمە چونکی ڕێگای بازرگـانی و دەرچوون لەمەککەیان لێبەسترا. قورەیش ئەبو سوفیانی کوڕی حەربیان نارده خدمەت پێغەمبەر(د) گوتیان بۆ خاتری خوداو بۆ خاتری حقوقی خزمایەتیمان بنێریتە لای ئەبو بەصـیرو جەمـاعەتەکـەی هیچیتر ڕێگا بە کاروانەکانمان نەگرن. لەسەر ئەم مەرجە هەر کـەسی لەمـەککە مـوسولمان بوو ئەگـەر هاتە مـەدینە پێـغـەمـبـەر نەیگـەڕێنـتـەوە -ڕەدی نەکاتەوە- ئنجا ناردیە لای جەماعەتە یاخیبووەکەی- کە لە کوفر یاخیببوون. ڕێگایان بۆ قـورەیش بەردا چوونەوە مـەدینە ئنجا خودای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارێ [بسـم اللـه الرحـمن الرحـيم وهـوَ الَّذي كَفَّ أيديَهُمْ عَنْكُم وأيديَكُم عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ من بَعْـدِ ان أظْفَرَكُم علَيْهم... هەتا.. الحمية حمية الجاهلية]. مەبەست لەحەمیەتی جاهلیە یەکەم: تووڕەبوون و خـۆگەوره زانینیـان بوو لەباوەڕی بە رسـالەتی پێـغەمـبەر(د) چونکی گـوتیـان ئەگەر بمان زانیبوایە تۆ پێغەمبەری خودای دووەم: لێنەگەڕان لە کاغەزی موعاهەده بسم الله الرحمن الرحيم بنووسرێ سێیەم: نەیان هێشت زیارەتی کەعبە بکەن.

# كتـــاب الوصـايـا

## باسی وەسیەت کردن

٧٠٠: عن عبدالله ابنِ عُمَر رضي الله عنهما أن رسولَ اللّهِ صلّى الله تَعالى علَيه وَسلَمَ قالَ: ما حَقُّ أمرِئٍ مُسْلم لَهُ شيئٌ يُوصي فيهِ يَبيتُ لَيْلَتَيْنِ إلاّ وَوَصَيَّتُهُ مكتوبَةٌ عِندَهُ.

### تەرجەمە

٧٠٠: دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بێ. بەڕاستی پێغەمبەری خودا(د) فەرمووی هیچ عەقڵێکی باش و لەخواترس و احتیاطێک نی‌یە بۆ ئەو پیاوە موسولمانەی شتێکی وای هەبێ کەڕاست وەصیەتی تیابکرێ دووشەویشی لابمێنێتەوە تەنیا ئەو کاتە نەبێ وەسیەتەکەی چەسپاو بێ بە دووشاهێد نووسراشبێ لای خودا.

(ش) لەفظی (حَقٌ) لێرە بۆ وجوب نی‌یە هەروەکوو ئیمامی نەوەوی لەشافعی نەقڵ کردووە. کەوایە وەسیەت بەحەج و بەزەکات و بەحەقی خەڵکی بێ شاهێد ئەگەرچی واجبیش بێ. بەڵام وەصیەت بەخێرو صەدەقە یەک لە سێ‌یەکی میرات١/٣ لای هەر چوار مەزهەب واجب نی‌یە بەڵکی سونەتە بەشەرع باشە «حەق بەمەعنای حەزم واحتیاطە، بۆیێ لە تەرجەمەش وانووسرا. لەمیراتی مردوو مافەکانی خودا پێش دەخرێ بەسەر مافی خەڵکی لەمافەکانی خوداش زەکات لە حەج لەپێش‌ترە لەپاشان جێبەجێ کردنی ئەو وەسیەتەی کە بەشاهێد دیارکرابێ لەپاشان مافەکانی میراتگران «ورثە».

٧٠١: عَنْ أبي هريرةَ (ض) قالَ رَجلٌ للنبيِّ صلى الله تعالى عليه وسلم. يارسول الله أيّ الصَدقةِ افضَلُ:قالَ أنْ تتَصدَّقَ وَأنْتَ صَحيحٌ حَريصٌ تأملُ الغني وتخشى الفَقْرَ. ولا تُمهِلْ حتّى إذا بَلَغَتِ الحُلقوم قُلْتَ لفلانٍ كذا ولفُلانٍ كَذا وقَد كانَ لفلانٍ.

### تەرجەمە

٧٠١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پیاوێک بەپێغەمبەری گوت کامە خێرو صدەقەیەک گەورەترە فەرمووی ئەو صەدەقەیە گەورەترە کە لەحالی

صحەت و تەندروستی باشدا بیکەی. ڕشت و حەریص بی لەکۆکردنەوەی مالّ ئومێدی دەلەمەندیت هەبێ وە بشترسێی کەهەژارو موحتاج بی. بەدوا مەخە وەصیەت بۆ کاتێک کە ڕووح بگاتە گەرووت بلێی فلان شت بۆ فلان بێ و فلان شتم بۆ فلان بێ کە شتەکانیشت هەمووی بوویتە مالی میرات گران ئەگەر هەوەسیان لێ بێ لەسێیەک زیاتر وەرنەگرن (واتە ئەوەی کە تۆ دای دەنێی بەتالی دەکەنەوە) لەم حەدیثە وازاندرا بۆ صەدەقە سێ پلە هەیە یەکەمین لەهەموان چاکترە لەحەیاتی خۆت و لەتەندروستیدا بیکەی دووەم ناوەنجی‌یە لەژیانی خۆتدا بیکەی بەلاّم لەکاتی نەخۆشی سێیەم ئەوەیە کە لەپاش مردن بەهۆی وەسیەت بکرێ.

**٧٠٢: عَنْ أبي هريرةَ (ض) يامعَشْرَ قُرَيش إشتروا أنفُسَكمْ: لا أُغني عَنْكُمْ مِنَ اللّهِ شَيَئاً يا عَبّاسُ ابن عبدالمطّلبْ لا أُغني عَنْكَ من اللّهِ شيئاًيموِيا صفيّة عمّة رسولِ اللهِ لا اغني عنكِ مِنَ اللّهِ شَيئاًيم ويا فاطمةُ بنتُ محمدٍ سَلَيني ماشِيئْتِ مِنْ مالي لا اغني عنكِ مِنَ اللّهِ شيئاًيم**

### تەرجەمە

٧٠٢: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی خودای گەورە وەکوو ئایەتی -وانذر عشیرتک الأقربین هاتە خوارێ. پێغەمبەر (د) هەلستا چوو لەسەر کێوی (صەفا) ڕاوەستا فەرمووی ئەی عەشیرەتی قورەیش ڕووحی خۆتان قورتار کەن لە عەزاب بەهۆی موسولمان بوون گوێ ڕایەلی فەرمانی خودا بن. لەپاشان ناتوانم عەزابی خواتان لەسەر هەلگرم. ئەی بەنی عبدالمناف من ناتوانم عەزابی خودا لەئێوە دوورخەمەوە ئەی عباس کوڕی عبدالمطلب من ناتوانم عەزابی خودا لەتۆ دوور بخەمەوە. ئەی صەفیەی خوشکی باوکی پێغەمبەری خودا. من ناتوانم عەزابی خودا لەتو دوور بخەمەوە. ئەی فاطمەی کچی محمد لەمالی من هەرچی حەزدەکەی لێم بخوازە بەلاّم ناتوانم عەزابی خودا لەتۆ دوور بخەمەوە. ئەم حەدیثە وادەگەیەنی کە بەشی ئافرەتان لەکۆمەلی خزم و کەسن. مندالیش لەوانن واتە ئەولادی هەرکەسێک لازمیش ناکا خزم و کەس هەر میرات گرێ و موسولمان بی بەلاّم لای شافعی وەکوو حەنەفی لەوەسیەت کردن بۆ خزم و کەس. دایک و باوک و ئەولاد خارجن لەخزم بەلاّم باپیران داخلن. چونکی باوکو کوڕەکەی نەزانراون بەخزم. بەلکی خزم ئەوەیە بەواسطە ئنتسابی هەبێ وەکوو ئەحفادو ئەجداد واتە کوڕەزاو باپیران. دەورویشت لەئامۆزاو براو ئەوانی تر بەلاّم لای متولی بەقەطعی بەهەموویان

دەڵێن (أقارب) خزم چ بەخۆی بێ یان بەواسطە بێ.

(ش) بە قەرینەی ئەمە کە ئەبو هورەیرە لەپاش هیجرەش لەمەدینە موسوڵمان بوو. ئەم حەدیثەش لەمەککە گوتراوە چونکی دەڵێ پێغەمبەری (د) چووە سەر کێوی (صەفا) ئەم حەدیثە مورسەلە واتە ئەبو هورەیرە لەیەکیکی تری گوێ لێ بووە. بەڵام طەبەرانی ریوایەتی کردووە لەحەدیثی ئەبو ئیمامە کە پێغەمبەری (د) بنی هاشم و ئافرەتەکانی و خزمەکانی خۆی کۆکردەوە فەرمووی ئەی عائشە کچی ئەبو بەکر ئەی حەفصەی کچی عومەر ئەی ئومی سەلەمە ئنجا ئەگەر ئەمە ثابت بی هەروەکوو لە (فتح) وا دەڵێ دەلالەت دەکا کە ئەم انذارە دووجار ڕووی داوە جارێک لەمەککە وەکوو ئەم حەدیثە جارێکی تر لەمەدینە وەکوو حەدیثی طەبەرانی. بەقرینەی ئەمە کە حەزرەتی عائشە و حەفصە و ئومی سەلەمە لەمەککە لەخدمەت پێغەمبەر (د) نەبوون. بەڵکی لەمەدینە نائلی شەرەفی خزمەت پێغەمبەر (د) بوون بەدایکی ئیماندارا‌ن.

**٧٠٣: عَن ابن عمر (ض) قالَ ابوه عمر یارسول الله إنّي إستَفَدتُ مالاً وهو عندي نفیسٌ فاردْتُ أن اتصدَّقَ به فقال النبي صلی الله تعالی علیه وسلم تصدَّق بأصلِهِ لایُباعُ ولایوهَبُ ولایورَثُ ولٰکنْ یُنفَقُ ثَمَرُهُ.**

## تەرجەمە

٧٠٣: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودایان لێ بی کەباوکی پارچە عاردێکی لەناقاری خەیبەر لە بەرامبەری مەدینە هەبوو دارخورمای تیابوو پێیان دەگوت (ثمغ) عەرزی پێغەمبەری کرد گوتی یارسول الله من ماڵێکی بەقیمەتم استفادە کردووە ئەم پارچە عەردەیە لای من بەقیمەتە وە خۆشەویستە ئیرادەم وایە بیکەم بە صەدەقە پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەصلەکەو ڕەقەبەکەیو زاتەکەی بکە صەدەقە نەفروشرێ. وەهبە نەکرێ وە بەمیرات نەگیرێ بەڕێگەی وەقف بەم تەرزە سوودەکانی و بەرەکەی لەڕێگای خودا صەرف بکرێ ئنجا حەزرەتی عومەر گوتی گێڕام بەصەدەقە صەرف بکرێ بۆ ئەو موجاهدانەی دەست کورت بەشیان لەفەیئ نەبێ. وەبۆ ئازادکردنی بەندە واتە بەقازانجەکەی بەندان بکڕن وە ئازادیان بکەن وە بۆ هەژارو موحتاج بەهەندێ پێویستی. وە بۆ ئەو کەسانەی لەڕێگادا دەڕۆن و هیچ خەرجیان نیە وە بۆ خزم و کەس ئنجا چە خزمی باوک بێ یان دایک وە بۆ ئەو کەسەی کە ئاگای لەماڵەکەیەو بەناوی دەینی و ئیدارەی دەکا. هیچ گوناه نەبی ئەگەر لەسەر عورف و عادەتی خەڵکی هەندەی کرێی ئیش کردنی

خۆی لێ بخوا وە دەرخواردی برادەری خۆشی بدا. بەڵام هیچ شتێک لەعاردەکە نەکاتە ملک وماڵی خۆی.

(ش): لەو مەرجانەی کە حەزرەتی عومەر بۆ ئەو کەسەی دانا کە چاودێری عاردەکە دەکا وەرگرتنی کرێ لەماڵی هەتیم وەبۆ ئەو کەسەش کە ماڵەکە وەقف دەکا دروستە لەبۆ نەفسی خۆشی شتێک بگێرِی بەمەرج لەسوودەکانی ئەو ماڵی کەوەقفی کردووە. چونکی حەزرەتی عومەر کردیە مەرج بۆ ئەو کەسی موتەوەلی و ناظرە (چاودێری کەر) کەلێی بخوا بەتەواوی واتە بێ ئەوەی بیبەستینەوە بەوکەسەی ماڵەکەی وەقف کردووە یان بەکەسانی تر ئەمەش دەلالەت دەکا لەسەر ڕاستی مەرج لای ئیمامی مالک دەسەڵاتی چاودیری بۆ واقف نی‌یە بەهیچ جۆرێک. ابو یوسف لەمەی وەرگرتووە راستە هەریەکێک ماڵ لەسەر خۆی وەقف بکا لای ئیمامی شافعی راستە وەقف لەسەر نەفسی خۆی بەڵام حاکم حوکمی پێ کردبی لەپاش دەعوایەکی راست وە داواکردنێکی ڕاست. وە لەم حەدیثەش وەردەگیری کە وەقف لەزەمانی پێغەمبەر (د) هەبووە. ئیمامی شافعی گوتیتی نەم زانیوە ئەهلی جاهلیت عاردێک یان خانوێکیان گێڕابێ بەخێرو صەدەقەو وەقف بەیهەقی لەکتابی مەعریفە وای گوتووە.

ئیمامی احمد بەنەقل لەحەزرەتی عومەر گوتیتی یەکەم صەدەقەی وەقف کراو لەئیسلام صەدەقەی عومەر بوو.

**٧٠٤: عَن أبي هُرَيرَةَ (ض) إجتنبوا السَّبْعَ الموبِقاتِ. قالوا يارسول الله وَماُهُنَّ. قالَ الشِّرْكُ باللّهِ والسِّحرُ وقَتْلُ النَّفْسِ التي حرَّم اللّهُ إلاّ بالحَقّ. وَآكْلُ الرِّبا واكلُ مالِ اليَتيم والتَوَلّي يومَ الزَّحْفِ وقَذْفُ المحصناتِ المؤمِناتِ الغافِلاتِ.**

## تەرجەمە

٧٠٤: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی. پێغەمبەر (د) فەرمووی خۆتان بپارێزن لەحەوت گوناهی گەورەی بەهیلاکدەر گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا. ئەو حەوت گوناهە گەورانە کامەیانن فەرمووی ١- هاوبەش دۆزینەوە بۆ خودا. ٢- سحر «واتە لابردنی شتێ لەسەر ڕووی ظاهری مەخصوص بەخۆی. ٣- کوشتنی هەر کەسێک مەگەر خودا حەلالی کردبی بەحەق. ٤- خواردنی ریبا- واتە زێدەکی قەرد. ٥- خواردنی ماڵی هەتیو. ٦- راکردن لەڕۆژی کوشتاری موسولمان و کافر. ٧- نسبەت دانی زینا وەبال ئەو ژنانەی کەپاکن لەزیناکردن.

ش: دیارکردنی ژمارەیەک لەگوناهی گەورە ئەوە ناگەیەنی کە گوناهی گەورە زیاتریش نین لەمانە. وەکو زینا لەگەڵ جیران ئەزیەت دانی دایک و باوک و سوێندی بەناحەق. هەروەکوو لەمەپێش باسمان کرد. لەمە پاشیش باسی دەکەین انشاالله.

٧٠٥: عن أبي هريرَة (ض) لاتَقسِمْ وَرَثَتي ديناراً ولا دِرْهَماً ماتَرَكْتُ بَعْدَ نفقةِ نِسائي ومؤنةِ عاملي فهوَ صَدَقَةٌ.

**تەرجەمە**

٧٠٥: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی. بابەش نەکەن میرات گرەکانم نە دینارێک نە درهەمێک هەرچی کەبەجێم هێشت لەپاش نەفەقەی ئافرەتەکانم وەلەپاش دانی کرێی چاودێری کەری ئەوقاف کەپێی دەلێن (ناظر) یاخۆ لەپاش کرێی خەلیفەو جێ نشینم هەمووی وەقفەو دەگەڕێتەوە بۆ بیت المال.

(ش) خێزانەکانی پێغەمبەر چونکی دایکی هەموو ئیمانداران مێردکردنیان لەسەر حەرام بوو بەئەبەدی ئنجا وەکوو ئافرەتێک لەعیدە دابێ نەفەقەیان بۆ داندرا هەتا مردنیان. وە خانوو جێ دانیشتنیان بۆ داندرا وەکوو پێغەمبەر مابێ ئەوها وە بۆ ئەوانەی چاودێریان دەکردن کرێ یان بۆ داندرا. ئەو میراتەی تریش کە لەپاش پێغەمبەر مایەوە بەناوی بیت المال تۆمارو تسجیل کرا. بۆیێ خەرقەی پیرۆزی ئەوو شیری و شتەکانی تریشی نەدرایە حەزرەتی فاطمەو حەزرەتی عەباس وە هەرچی درایە خێزانەکانیشی بەناوی میرات هیچیان پێ نەدرا هەمووی بوو بەمالی موسولمانان لەبیت المال بەوەرگرتن لەم حەدیثە هەروەکوو لەحەدیثێکی تریش هاتووە فەرموویەتی [انا معشر الانبیاء لانورث] واتە ئێمەی پێغەمبەران میراتمان لێ ناگیرێ] لەم حەدیثەش کە ناوبراون بەورثە بەمەجازە.

٧٠٦: عن عثمان (ض) مَنْ حَفَرَ رومة فله الجنّةُ مَن جَهَزَ جيش العُسْرَةِ فَلَهُ الجنّةُ.

**تەرجەمە**

٧٠٦: دەگێڕنەوە لەئیمامی عوسمان ڕەزای خودای لێ بی لەکاتی موحاصەرە کرا لەلایەن خەلکی مصر. لەخانووی خۆی. پێی گۆتن بۆ ڕەزای خودا- ئەصحابی پێغەمبەر (د) قسەم تەنیا لەگەڵ ئێوەیە: ئەدی پێغەمبەر نەی فەرموو. هەر کەسێک بیری [ڕومە] سازبدا بەتەعمیرو کرین. بەهەشت بۆ ئەوە. وەمنیش کریم و تەعمیرم کرد حەزرەتی عەلی

و طەلحەو زبیرو سعد ابن ابی وقاص گوتیان ڕاست دەکەی. دیسان دووبارە پێی گۆتن ئەدی نازانن پێغەمبەر (د) فەرمووی هەر کەسێک بۆ غەزای تەبووک تەجهیزات و نیدارەی لەشکر بکا لەم زەمانی قاتی و گرانی بەهەشت بۆ ئەوە گوتیان بەلێ وای گوت. گوتی من بووم لەشکری عوسرەتم ئامادەکرد بەچەک و خواردن لەسەرچی من دەکوژن.

(ش) هۆی دەورەدانی مالّی ئیمامی عوسمان ئەمەبوو: عبداللەی کوڕی سعدی کوری سرح کە لەزەمانی پێغەمبەر لەمەدینە نووسەری وەحی بوو لەموسولمانی‌یە تێ‌گەڕاوە بووە مورتەد گەڕاوە مەککە. لەپاشان وەکو مەککە گیرا لەلایەن موسولمانان لە [مهدر الدمان] (واتە خوێنی حەلال کرابوو) بو بەهۆی خزمایەتی‌یەک کە لەگەلّ ئیمامی عوسمان هەی بوو واسطەی بۆ کرد لێ بووردراو عەفووکرا. دووبارە موسولمان بۆوە. لەخەلافەتی ئیمامی عوسمان لەجێگای محمد ابن ابوبکر لەمصر بەوالی داندرا. لەبەر زولم و ستەمی ئەم (عبداللەی کوری سعدی کوڕی سرح)ە ڕکی‌یان لەئیمامی عوسمان بۆوە. لێی هەلستانەوە هاتنە (مەدینەی پیرۆز) دەورەیان لەخانووی ئیمامی عوسمان دا. لەکاتی دەورە لێ دانی خانووی ئیمامی عوسمان هەرچەندە ئەم حەدیثەشیان بەڕاست زانی بەلاّم گوتیشیان تۆ لەزەمانی پێغەمبەر باش بووی بەلاّم ئێستا پیاوێکی ناسراو بەکەونە مورتەدو خوێن حەلاّل کراو کە (عبداللەی کوری سعدی کوری سرح)ە لەسەر ئێمەت موسەلەت کردووە. ئیتر ئابلۆقە دانی مالّەکەیان دەوامی کرد لەئەنجام ئیمامی عوسمان شەهید کرا. لەپاش ئەم ڕووداوە ناخۆشە هەر شەڕێکی لەنێو میلەتی ئیسلام ڕووی دابێ لەئەنجامی ئەم مصیبەتە گەورەیە بوو.

عادەتەن چونکی سەرەتا بوو بووە نوقطەیەکی مەرکەزی بۆ هەموو خطوطی کوشتاری عالەمی ئیسلام هەتا ئێستاش. حەزناکەم بەدرێژی باسی بکەم بەلاّم ئەگەر (تأمل) بکەی دیارە. چونکە بەگوێرەی ئەم قسەی کە دەلێ **[الصبر في الصدمة الاولى]** موصیبەتی گەورە هەر ئەوەندە زەحمەتە هەتا جارێک دەکرێ جاری دووەم ئاسانترە لەیەکەم جاری سێ‌یەم ئاسانترە لە دووەم جاری چوارەم لەسێ‌یەم ئیتر هەر بەم تەرزە وای لێ دێ ئەم موصیبەتە گەورەیە پێی ناگوترێ موصیبەش بەلکی بەناوێکی باشیش تەعبیر دەدرێ. وەکو ئێستا هەرچەند ڕەخنەکانی دینی هەیە لەسنوری ئافرەتان و کردنی کاری نابەجێ پێی دەگوترێ (تەمەدون) «واتە شارستانیەتی» بەوانەی کە ئەم کارە خراپانەش دەکەن و دایان دەمەزرێنن پێی یان دەلێن (ڕەوشن بیری- یان منوەر). ئنجا بەبێ باکی و بێ غەمی لەمەحکومیەتی ئادابی شەرع و ئەخلاق و انسانیەت. ئارەزووی نەفسانیەی خۆیان لەهەموو کارێکی بێ شەرعی بە سەرفیرازیەکی تەواو بەجێ دەگەیەنن.

# كتـاب الجهـاد

## باسی جهاد

جهاد: کوشتار لەرێگەی خودا.

٧٠٧: عَن أبي هريرة (ض) لا أجِيُدهُ. هَلْ تَستطيعُ اذا خرَجَ المجاهِدُ ان تدخُلَ مسجِدك فتقومَ ولاتَفْتُرَ وتصومَ ولا تُفطِرَ قالَ وَمن يستطيعُ ذلكَ.

### تەرجەمە

٧٠٧: دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر (د) گوتی کارێکم نیشاندە هەندەی (جهاد) واتە شەڕکردن لەرێگەی خودا پاداشتی هەبێ. فەرمووی هیچ کاری وا پێ نازانم. پاشان فەرمووی ئەرێ دەتوانی وەکوو مجاهد لەمالی خوا بۆ جهاد چووە دەرێ تۆش بچی‌یە جێگای نوێژی خۆت هەر نوێژ بکەی وە سستیش نەبێ لەنوێژ کردن وە بەڕۆژوش بی وە ئیفتاریش قەت نەکەیەوە پیاوەکە عەرزی کرد کێ ئەمەی پێ دەکرێ یەعنی هیچ کەسێک پێ‌ی ناکرێ زاندرا ئەم حەدیثە. موجاهید وەکوو لەخانووی خۆی بەنیەتی جیهاد چووە دەرێ بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەخوا پەرستی دایە بەشەوو بەڕۆژ لەهەموو حالێکدا. چی بخوا چی بنوی چی هەلبستی چی بگەڕێ لەمەپێشیش لەحەدیثی أبو هورەیرە ڕەت بوو هەتا لەبەرامبەر ترس و لەوەڕو جێ سمی وولاغەکەشی پاداشت دەنووسرێ. عەقلیش قبوول دەکا وابێ چونکی هەر خواپەرستی یەک یان بەماڵە یان بە سەرفی هێزی لەش و جەستەیە. یان بەسەرفی هەر دوویانە جیهاد نەبێ کە بەبەخشینی هێزو ماڵ و ڕووحە [ان الله اشترى من المؤمنين انفسهم واموالهم بان لهم الجنّة يقاتلون في سبيل الله فيقَتُلونَ ويُقتلون وعداً عليه حقاً في التورات والانجيل والقرآن وَمن أوفي بعَهدِهِ فاستبشروا ببيعِكُمْ الذي بايعْتُم بهِ]. اللهم ارزُقنا الجهادَ في سبيلك وانلنا درجةَ الشهادَةِ على ماتِحبُ وترضى ياارحم الراحمين.

٧٠٨: عَن ابي سَعيدٍ (ض) مُؤمِنٌ يُجاهِدُ في سَبيل اللّهِ بنَفْسِهِ وَمالِهِ. قالوا ثمّ مَنْ قالَ مؤمِنٌ في شِعْبٍ مِنَ الشعاب يتقي اللّهَ وَيَدْعُ الناسَ مِن شَرّهِ.

### تەرجەمە

٧٠٨: دەگێرنەوە لەئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بی. بەپێغەمبەر گوترا لەمەپێش ڕەت بوو ئەبو ذەر پرسیارێکی وای کرد لە پێغەمبەر (د) بەلام ئەوی

پرسیارەکەی تری کرد نەزاندرا کێیە بەپێغەمبەر گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا کامەکەس گەورەترە لەخەڵکی فەرمووی ئیماندارێک بەماڵ و ڕوحی خۆی غەزا بکا لەڕێگای خودا پێ یان گوت پاشان کێ: فەرمووی ئیماندارێک بۆئەوەی دوورکەوێتەوە لەکاری خراپ وەکوو درۆو غەیبەت و کاری بێ شەرعی لەدۆلەچیایەک دابنیشی لەترسی خودا هەر خەریکی خواپەرستی بی وە نەهێلی خەڵکی تریش شەڕو بەدکاری لەئەو ببینن وە زیانی بۆ کەس نەبێ.

(ش): ئەگەرچی مەزهەبی جمهور لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون وا باشترە لەگەڵ خەڵکی تێکەڵاو ببی نەک دوورکەوتنەوە لەخەڵکی لەبەر حەدیثی ترمذی [المؤمِن الذي يخالط الناسَ ويصبرُ على اذاهم اعظم اجراً مِن الذي لايخالط الناس ولايصبرُ على أَذاهم]. بەڵام لەبەر حەدیثی ئێرە خۆ دوورخستنەوە لەخەڵک گەورەترە. ڕێک کەوتنیش لەبەینی ئەو دوو حەدیثە حەدیثی ترمذی تایبەتە بەزەمانی سەلەف واتە پێشان کە داواکاری زانین و داواکاری دین بوون حەدیثی ئەبو سەعیدیش تایبەتە بەم زەمانی ئێستامان مێژووی (١٣٧١)هـ کە لەبەر خەریک بوون بەئارەزووی نەفسانیەو کاری نامەشروع داواکاری دین و زانین لەعالەم بوویتە (عەنقا) ئنجا چونکی الحكم لمن غلب هەر چەند پیاوی ئیماندار لەسەر حەقیش بی لەبەر کەمی لەناو ازدحام مەغلوبە لەکەلک گەیاندن بەخەڵکی. ئەگەر لەناویان ڕابکا بۆ پارێزگاری دینی خۆی و سەلامەتی خەڵکی لەشەڕی خۆی عەینی مەطلوبە. کەوایە هەر یەکێک لەم حەدیثانە تایبەتە بەصنفێک لەخەڵکی اعانن الله منافاة نییە. (واتە ئەم دوو حەدیثە پێچەوانەی یەکتر نین).

**٧٠٩: عن أبي هريرَة: مَثَلُ المجاهِدِ في سَبيل اللّهِ والله أعلَمُ بمَن يُجاهِدُ في سبيله. كمثل الصائم القائم وتوكّل اللهَ للمجاهِدِ في سبيلِهِ بانْ يتوفاهُ انْ يُدخِلَهُ الجنّةَ او يُرجِعَهُ سالماً مَعَ اجْرٍ او غَنيمةٍ.**

### تەرجەمە

٧٠٩: دەگێڕنەوە لەئەبو هوریرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) صفەتی پیاوی شەڕکەر لەڕێگای خودا کە خوداش خۆی زانایە بەو کەسەی کە مەبەستی لەناو دلی خۆی لەشەڕ کردنەکە بەرز کردنەوەی کلمەی خودایە یا مەبەستی ناوودەنگ و طەمەعە. وەکو صفەتی کەسێکە بەڕۆژ هەر بەڕۆژوو بێ بەشەویش هەر لەنوێژدابێ یەعنی یەک سەعات لەطاعەت غافل نەبێ چونکی موجاهیدیش لەهەموو ئەحوالی خۆی

لەطاعـەت دایە) وە خوداش بەچاکەی خۆی کەفیلە بۆ موجاهید لەڕێگای ئەو بەم تەرزە یاخۆ ڕووحی وەریگری بیخاتە نێو خۆشی‌یەکانی بەهەشتی خۆی بەبێ حساب و عەزاب یاخۆ بیگێڕیتەوە بۆ نیشتمانی خۆی بەسەلامەتی بە پاداشتەوە یاخۆ بە غەنیمەتو کەلکی دونیا لەگەڵ پاداشت.

(ش) لەفظی ئەو کە کەوتووتە نێوان پاداشت و غەنیمەت بۆ منع الجمع نی‌یە بۆ منع الخلوه یە یەعنی ئەوانەی کە غەنیمەتیش دەگرن ئەگەرچی دوو سێ‌یەکی پاداشتیان کەمترە لەوانەی کە نەیان گرتووە بەڵام یەک لەسەر سێ‌ی پاداشتیان هەر بۆ دەبێ لەگەڵ غەنیمەت هەروەکوو عەینی ئەو مەفهومە موسلم ریوایەتی کردووە لەحەدیثی عبداللە کوری عەمری کوڕی عاص بەمەرفوعی یاخۆ ئەو بەمەعنا واوی جەمعە هەروەکوو نسائی لە طریقی زەهری بەواوی جمع لەئەبو هورەیرەی ریوایەت کردووە نەک بە (أو)- عینی ج٦ ص٥٣٣.

**٧١٠: عَن أبي هريرة (ض) مَن آمَنَ باللّهِ وبرسولِهِ وأقامَ الصلواةَ وصامَ رمضان كانَ حقّاً على الله ان يدخِلَهُ الجنّةَ جاهَدَ في سبيل الله أو جَلَسَ في ارضِهِ التي ولدَ فيها. فقالوا يارسولَ اللّه. أفلا نبشّرُ النّاسَ قال انّ في الجنّةِ مائةَ درجَةٍ أعدَّ اللّهُ للمجاهدينَ في سبيل الله مابين الدرجتين كما بين السماءِ والارضِ فاذا سألتمُ اللّهَ فاسألوهُ الفِردَوْسَ فانّهُ اوسطُ الجنّةِ وأعلى الجنّةِ أراهُ وفَوقَهُ عرشُ الرحمنِ ومنه تفجَّرُ انّهارُ الجنّةِ.**

### تەرجەمە

٧١٠: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە- ڕەزای خودای لێ بێ- پێغەمبەر (د) فەرمووی هەر کەسێک باوەڕی هەبێ بەخوداو پێغەمبەری خودا وە دەوامیشی هەبێ لەسەر نوێژکردن وە مانگی ڕەمەزانیش بەڕۆژوویی بەرێگەی چاکەو بەخشش حەقەو ثابتە لەسەر خودا کە بیخاتە ناو خۆشی‌یەکانی بەهەشتی خۆی چی جهاد بکا لەڕێگای خودا یاخۆ دانیشی لەو عاردەی کە لەوێ لەدایک بووە. ئەصحابەکانی پێغەمبەر گوتیانە پێغەمبەر (د) ئەی پێغەمبەری خودا ئەرێ ئەم موژدەیە بەخەڵکی ڕانەگەینین چونکی ئەمە دڵدانەوەیەکی گەورەیە بۆ ئەوانەی بێ بەشن لەجهاد کە بزانن با مەحرومیش بن لەپاداشتی جهاد بەڵام کردنی فەرزەکانی ئیسلامەتی و پاداشتی باوەڕی بەشێکیان هەیە پێ بچنە بەهەشت ئەگەر پلەو روتبەیان لەخوار موجاهیدانیشە).

پاشان بۆ دەفعی وەهمی مساوات لەبەینی موجاهیدو ساکن لەوەتەن (واتا ئەوەی

لەنیشتمان ماوەتەوە) فەرمووی بەڕاستی لەبەهەشت سەد مەرتەبە هەیە خودای گەورە سازی داوە بۆ ئەو کەسانەی غەزا دەکەن لەڕێگای خودا بەینی هەردوو مەرتەبەیەک بەقەدەر بەینی عاردو ئاسمانە. ئنجا ئەگەر پرسیار دەکەن لەخودای گەورە رجای فیردەوسی لێ بکەن چونکی ئەوێ لەپیرۆزترین و باشترین جێگەی بەهەشتە وە لەسەرەوەی بەهەشتە. وا بیردەکەمەوە عەرشی خودای گەورەش لەسەرەوەی فیردەوسە لەوێ ڕووبارەکانی بەهەشت دەردەچن هەروەکو ئایەتی پیرۆز تەصریحیان پێ دەکا بەفەرموودەی خۆی [فیها انهارٌ من ماءٍ غير آسِنٍ وانهر من لبن لم يتغير طَعْمَهُ وانهارٌ مِن خَمر لذَّةٍ للشاربين وانهار من عَسَلٍ مصفّى]. ترمذی گوتیتی فیردەوس گردێکە سەیرانگاهو مونتەزەهە بۆ ئەوانەی لەبەهەشتن.

(ش) طیبی لەشەرحی مشکاة گوتیتی پێغەمبەر (د) بەصورەتێکی ظاهرە وەلامی ئەصحابی نەداوە أفلا نبشر الناس بەلکی بەصورەتێکی حەکیمانە وەلامی دانەوە بەم تەرزە کأنە فەرمووی بەڵێ: مژدەیان پێ بدەن بەچوونە بەهەشت بەسەبەب باوەڕهینان و نوێژو ڕۆژوو بەم مژدەیەش اکتفا مەکەن بەلکی مژدەشیان پێ بدەن کە شەهید زەفەر بەدەرەجاتی بەرزی خۆی دەبا بەچاکەی خودا. بەمەندەش قەناعەت مەکەن بەلکی مژدەشیان پێ بدەن بەفیردەوس کە بەرزترین و پیرۆزترین جێگەی بەهەشتە.

٧١١: عَن اَنَسٍ (ض) لغُدوَةٌ في سَبيل اللّهِ او رَوحَةٌ خيرٌ مِن الدُّنيا وَمافيها.

### تەرجەمە

٧١١: دەگێڕنەوە لەئەنەس (ڕەزای خودای لێ بی) بێ گومان و بەڕاستی پاداشتی دەرچوونێکی دانە ڕۆژێکی سبەینەی تا نیوەڕۆ بۆ غەزا لەڕێگای سەرکەوتنی کەلیمەی خودا کە تەوحیدو خوا بەیەک زانینە یاخۆ دانەڕۆژێکی هێوارە لەنیوەڕۆ تا ڕۆژئاوا باشترە لەهەموو دونیاو هەرچی لەدونیاشدا هەیە.

**دیسان لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (د) فەرمووی:**

**[لقابُ قَوسٍ في الجنّةِ خيرٌ مِمّا تطلُع عليه الشمس وتغرُبُ].**

لەئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (د) فەرمووی بێ گومان هەندەی کەوانێک جێگا لەبەهەشت باشترە لەهەر جێگایێکی کە ڕۆژی لێ هەڵدێ و لێ ئاوا دەبێ لەدونیا مەبەست لەم دوو حەدیثە پیرۆزە هاندانی موسولمانانە لەسەر جیهاد کە دەبیتە هۆی خۆشییەکانی بەهەشتی هەتا هەتایە.

٧١٢: (الحور العين): باسی صفەتەکانی حور العين:

**عَن أنسٍ ابن مــالك (ض) لو انَّ امــرَءةً مِن اَهلِ الجنَّةِ اطَّلَعَت الى اَهْلِ الأَرضِ لأضاءَت ما بينهما ولملأَتْهُ ريحاً ولنصيفُها على رأسِها خيرٌ مِن الدّنيا وَمافيها.**

## تەرجەمە

٧١٢: دەگێڕنەوە لەئەنەس کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر ئافرەتێک لەوانەی لەبەهەشتن خۆی بەدیار بخا بۆ ئەوانەی لەعارد دەژین بەڕاستی نێوان عاردو ئاسمان ڕۆناک دەکا پڕی بۆنی خۆشیشی دەکا. چونکی ابن الملقن دەگێڕیتەوە لە ئیبنی عەباس رەزای خودای لێ بی: حور العین دروست کراوون لەئەنگوستی قاچیان هەتا ئەژنۆیان لەزەعفەران لەئەژنۆشیان تا مەمکیان لەمسکی بۆنداری کەسکوون لەمەمکیشیان تا ملیان لەعەنبەری سپی لەملیشیانەوە لەگەڵ سەریان لەکافووری زۆر سپی یەعنی لەجیاتی عەناصری انسان و گیاندارانی دونیا لەئاوو ئاگرو خاک و بایە عەناصری حور العین زەعفەران و مسکو عەنبەرو کافوورە: یاخودا بە بەخشش و چاکەی خۆت سەرمان بخەی و بێ بەشمان نەکەی لەم نیعمەتانەت. وە بەڕاستی چارۆگەشیان کە لەسەر سەریتیان بۆ جوانی‌یە چونکی دەربەست نین بەخۆ داپۆشین باشترە لەدونیاو لەهەرچی لەدونیادایە دیاربوو لەم حەدیثە پیرۆزە کە حور العین ئافرەتەکانی دونیا نین.

**٧١٣: عَن انَس (ض) ان بَلِّغوا قَوْمَنا ان قَدْ لقينا رَبَّنا فرضيَ عَنّا ارضنا. قال انَسٌ كنا نقرأُ اَن بَلِّغوا الخ ثُمَّ نُسخَ بَعْدُ فاَخبَرَ به جبريلُ.**

## تەرجەمە

٧١٣: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) حەفتا کەسی نارد لەوانەی قورئانیان لەبەر بوو و زانا بوون بەکاروباری ئاینی بەسەرۆکایەتی خالم برای ئومی سولەیم بوو ناردە سەر بەنی عامر یان و بەنی سولەیم لەبیری مەعونە کە سەرۆکەکەیان عامری کوڕی طوفەیل بوو خالم کە حەرامی کوڕی مەلحانبوو گوتی من لەپێش ئێوە دەچمە ناویان ئەگەر تەئمینیان کردم هەتا ئەسپاردەکانی پێغەمبەریان پێ ڕادەگەیەنم ئەگەر نا ئێوە لەمن نزیکن بەئیمدادم دەگەن ئەگەر فکری غەدریان هەبی. وەکوو چووە ناویان تەئمینیان کرد ئەسپاردەکانی پێغەمبەری بۆ دەگێڕانەوە لەکاتی قسەکردن نیشارەیان کرد بەپیاوێک لەکافر ڕمێکی وای لەتەنیشتیدا لەلایەکەی تری دەرچوو خالم

حەرام گوتی الله اکبر زەفەرم برد بە دەرەجەی شەهادەت قەسەم بە خودای کەعبە. پاشان کافرەکانی بەنی سولەیم و بەنی عامری هجومیان کردە سەر ئەصحابی بەڕێزی پێغەمبەر هەموویان شەهید کران یەک پیاوی شەلە نەبی لەبەنی ئومەیەبوو چووە سەر کێوێک نەجاتی بوو حەزرەتی جویرەئیل بەئایەت ئەم خەبەرەی بۆ پێغەمبەر (د) هەناردە خوارێ [أن بَلّغوا هه تا أرضانا]. لەقورئان نووسرابوو دەمان خوێندەوە لەپاشان لەفظی نەسخ کرا لەقورئان دەرخرا.

(ش) لەو کتێبانەی شەرعی کە لەمەزهەبی ئیمامی شافعی داندراوون بڕیاری لەسەر دراوە ئایەتی مەنسوخ خوێندنی حەرام نییە دەستی لێدەی خوێندنیشی بەجەنابەت دروستە). ئنجا پێغەمبەر (د) چل سبەینە لەقنوت دوعای لە (رعل) و (ذکوان) و (بەنی لحیان) و (بەنی عوصەیە) کرد. کە عاصی بوون لەخوداو پێغەمبەری خودا جەریریش ریوایەتی کردووە لەئەنەس لەگەڵ ئەم ئایەتەی کە لەفظی ڕەفع کراوە واتە هەلگیراوە لەقورئان ئەم ئایەتەش هاتە خوارێ [وَلاتحسَبَنَّ الذينَ قُتِلوا في سبيل الله أمواتاً بل احياءٌ عند رَبِّهم يرزَقون]. لەمەزهەبی ئیمامی شافعی لەنوێژی سبەینە قنووتیان بەم حەدیثە اسپات کردووە لەمەزهەبی حەنەفی خوێندنی قنوت تایبەتە بەکاتی کارەساتی زۆر گەورە گەورە لەهەموو نوێژێک نەک هەر لەسبەینە دەلیلیش هەر ئەم حەدیثەیە چونکی دروستە لەگەڵ اجتهادی هەردوو مەزهەب دەگونجێ لەبەر ئەمە کە لەسبەینە بووە وەکو شافعی دەڵێ لەکاتی ڕوودانی کارەساتی زۆر گەورەش بووە وەکوو حەنەفی دەڵێ.

٧١٤: عَن جندب ابن سفيان (ض) هَلْ انتِ اِلاّ اصبَعٌ دَميتِ وفي سبيل اللّهِ مالَقيتِ.

### تەرجەمە

٧١٤: دەگێڕنەوە لەجوندوبی کوری سوفیان ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) لەهەندێ غەزا (گوتراوە غەزای ئوحود بووە) ئەنگوستی بەخوێن داهاتووە ئنجا فەرمووی بەقسەکردن لەگەڵ ئەنگوستەکەی ئەی ئەنگوست تۆ لەجەستەی مرۆڤ وەکوو ئەندامەکانی تر شتێکی هەندە بەئەهەمیەت و گەورە نی بەلکی هەر ئەنگوستەکی بریندارو خوێناوی بووی ئەمەش بەضایع ناچێ بەلکی لەڕێگای سەرگەوتنی کلیمەی تەوحیدی خودا وات بەسەردا هاتووە هەر ئەزیەتێکیش بۆ ڕازی بوونی خودا بێ هەرکات بێ سوود نییەو

بەخۆڕایی ناچی پێویستە شانازی بەو خوێن و برینە بکەی هەتا پاداشتت زۆربی. لەلایەن هەندێ ئەوانەی باوەڕی‌یان بەخودا نی‌یە گوتراوە کە لەقورئان هاتووە کە پێغەمبەر شاعر نی‌یە کەچی لێرە شیعریشی گوتووە: بۆ وەڵام دانەوە لەسەر ئەم قسەیە کە قورئان شیعر نی‌یە و ئەم حەدیثەش هەر شیعر نی‌یە دەڵێین:

لازمە لەشیعر قەصد هەبێ مقصودی پێغەمبەریش گوتنی شیعر نەبووە بەڵکی مەنطوقی دورِ فشاری بەبێ ئیرادەی شیعرو نیەتی وەزن لەسەر هەیئەتی شیعر بەتەصادوفی هاتیتە سەر زمان-

مەنفیش لەقورئان صفەتی شاعریەتە یەعنی بەقەصدو ئیرادە شیعر دابنێ یەکێکی تریش ئەوەیە کە لەبەحری رەجەزە یەعنی هەر مصرەعێکی لەسەر سێ مستفعلن هاتووە بەناتەواوی لەسەر غەیری ئەنواعی عروض لای ئەخفەش پێ‌ی ناگوترێ شیعر بەڵکی بەوکەسەی دەشی لێ پێ‌ی دەڵێن (ڕاجز) نەک (شاعیر) چونکی شیعر ئەبێ موقەفابێ لەسەر نەوعێک لە ئەنواعی عروض تەواویی زیاتر بی لە (٦) مستفعلن بە هەردوو مصرع.

٧١٥: عَن أبي هريرةَ (ض) والذي نفسي بيده لايُكلَمُ اَحَدٌ في سَبيل اللّهِ واللّهُ اعلَمُ بِمَن يُكْلَمُ في سَبيله الأ جاءَ يومَ القيامَة وجرحُهُ يَثْعَبُ دَماً اللَّوْنُ لونُ الدَم والريحُ ريحُ المِسكِ.

## تەرجەمە

٧١٥: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی سوێندم بەو کەسەی کە ڕووحی منی بەدەستە (یەعنی مولکی ئەوە لەدەست ئەوە) برێندار نابی یەکێک لەرێگای خودا کە خوداش خۆی دەزانی کێ لەرێگای ئەو بریندار دەبێ مەگەر بەبێ گومان ڕۆژی قیامەت دێتە خدمەت خودای گەورە بەم حالە کە خوێنی لەبرین دێتە خوارێ. خوێنەکەش بە ڕەنگ خوێنە بەڵام بەبۆن میسکە یەعنی بەڕاستی خوێنە بەڵام لەئەحکام و صفاتی دونیایی لەڕەنگ نەبێ لەهەمووی پاکە- واتە پیس نی‌یەو بۆنی ناخۆش نی‌یە ئیمامی نەوەوی گوتیتی گوتویانە ئەم گەورەیی‌یە ئەگەرچی دەرحەق بەکوشتاری کافرانە. بەڵام ئەو کەسەی برینداریش بکرێ لەکوشتاری زالم و عاصی لەحکومەتی ئیسلامی وە لەکوشتاری ڕێ گران وە لەکوشتاری فەرمان کردنی بەچاکەو دوورکەوتنەوە لەخرابە غەیری

ئەمانەش لەکاروباری چاک ئەو گەورەیی و شەرەفەی هەر هەیە. هەروەکوو ابن عبدالربیش بە استدلال بەحەدیثی [من قتل دون ماله فهو شهید] قەراری لەسەر ئەمە داوە.

بەڵام وەلی کوری عیراقی گوتیتی شەڕکەر لەسەر ماڵ ئەگەرچی شەهادەتی هەیە بەڵام گەورەیی شەڕکەر (موجاهید) بەڕووح زیاترە بەدەلیلی زیادەکردنی جومەلەیەکی موعتەرەضە لەبەینی مستثناو مستثنا منە بۆ بەگەورە زانینی شانی مەجروح (واتە بریندار) لەکوشتاری کافران کەسیتر نازانی چونکی کوشتارەکەی فی سبیل الله بووە. بەڵام کوشتاری حەدیثی ابن عبدالبتر (دون ماله)یە. [این هذا من ذاک]. واتا لەیەک دوورن. ئەوە لەکێ ئەو لەکێ.

٧١٦: عَن اَنَسٍ (ض) إِنَّ مِن عباد اللّٰه لو اقسَمَ علی اللهِ لابَرَّهُ.

## تەرجەمە

٧١٦: دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی ئەنەسی مامم کوڕی نەضر لە غەزای بەدر حازر نەبوو گوتی ئەی پێغەمبەری خودا لەیەکەم کوشتارت لەگەڵ کافران کە غەزای بەدر بوو ئامادە نەبووم لەساڵی دووەمی هیجری ئەگەر خودا حازرم بکا لەکوشتارێکی کافران بێ شک خودا دەمبینێ چەکارێک دەکەم ئنجا وەکوو غەزای ئوحود داکەوت وە ئەصحابی پێغەمبەر شکان مامم گوتی یارەبی لەم هەڵاتنەی ئەصحاب کە کردیان من پاکانەی خۆم لای تۆ دەکەم بێزارو بەریشم لە عەداوەتی کافران لەگەڵ دینی اسلام و پێغەمبەری خودا ئەم قسەی کرد، لەلەشکری کافران چووە پێش. سەعدی کوڕی مەعاذ لەڕاکرن ڕوو بەڕووی مامم بوو چونکە ئەنەسی مامم بۆشەڕی کافران دەچوو سەعدیش لەوێوە دەهات ڕووی لە ئەنەسی مامم بوو گوتی ئەی سەعد کوڕی معاذ ئیرادەی بەهەشتم هەیە بەحەقی خودای (نەفەر) کە باوکی بوو من بۆنی بەهەشتم بۆ دێ لەم غەزایەی ئوحود سەعد گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەرچی من لەهەموو کوشتارێک بەئازایی و بەهێزو قوەت ناسراوم بەڵام ئەو ئارام و خۆڕاگرتنەی لەودابوو لەمن دائەبوو هەرچەند درێغیم نەکرد وەکوو ئەوم پێ نەکرا ئەنەس گوتی هەشتاوکسور برینی شیرو تیرو ڕمان لەجەستەی پیروزی ئەنەسی مامم دۆزیەوە شەهید کرابوو لەپاش شەهادەت کافرەکانیش هاتبوونە سەری ئەندامی لەشیان لێ کردبۆوە وەکوو لوتو گوێچک و شتی وا هیچ کەس نەیناسی‌یەوە رویەیعی خوشکی نەبێ بەئەنگوستان ناسی‌یەوە ئەنەس گوتی

ئایەتی [مِن المؤمنين رجالٌ صَدَقوا ماعاهدوا اللّهَ عليه فمِنْهم من قضى نَحبَهُ ومنهم مَن ينتظر] دەرحەق بەمامم ئەوانی وەکوو ئەوون ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ئنجا گوتی رویەیعی کچی نەفەر کە خوشکی بوو خوشکی مالکی باوکیشم بوو ددانی ئافرەتێکی شکاندبوو پێغەمبەریش ئەمری فەرموو بوو لەپاش ڕازی نەبوونی داواکارەکان بەماڵ و ئاشت بوونەوە ددانی روبیع بەقصاص بشکێنرێ. ئەنەسی مامیشم سوێندی خوارد گوتی ئەی پێغەمبەری خودا بەحەقی ئەو زاتەی کە تۆی ناردووە بە پێغەمبەرایەتیەکی بەحەق ددانی خوشکی من ناشکێنرێ. ئنجا خودا شتێکی وای کرد سوێندەکەی لێ نەکەوت مودەعیەکان بەماڵ ڕازی بوون قصاص نەکرا. ئنجا پێغەمبەر (د) فەرمووی [بەڕاستی هەیە لەبەندەکانی خودا هەندێکی وا ئەگەر سوێندێک بخوا لەسەر خودا خودا لێ ناگەڕێ سوێندەکەی لێ بکەوی سوێندەکەی بۆ بەجێ دەگەینی. یەعنی ئەمەندەی خۆشدەوێ لێ ناگەڕێ سوێندەکەی لێ بکەوێ.

٧١٧: عَنِ البَراء (ض) أسلِمْ ثمَّ قاتل فاسلَمَ ثمَّ قاتَلَ فقُتِلَ.

### تەرجەمە

٧١٧: دەگێڕنەوە لەبەرائی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بی گوتی پیاوێکی ئەنصاری ئەوسی لەقەبیلەی بەنی نەبیت خۆی لەناو چەکو ئامێری شەڕکردن داپۆشیبوو هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا کوشتاریشدەکەم موسولمانیش دەبم پێغەمبەر (د) فەرمووی پێشان موسولمانبە پاشان کوشتار بکە موسولمان بوو پاشان کوشتاری کرد. وە شەهید کرا پێغەمبەر فەرمووی [عمِلَ قليلاً وأُجِرَ كثيراً] کارێکی کەمی کردو پاداشتێکی زۆریشی پێ درا واتە ئەنوێژی کرد وە ئەڕۆژووی گرت وە ئەحەجو زەکاتی دا بێ حساب و عەزاب گەیشتە خۆشیەکانی بەهەشت. حافظ ابن حەجەری عسقلانی گوتیتی من نازانم ئەم پیاوە ناوی چی بوو بەلام ابن اسحاق لە مەغازی بەئیسنادێکی صەحیح و تەواو لەئەبو هورەیرە دەگێڕیتەوە بەم تەرزە هەر جارە دەیگوت پێم بلێن چی پیاوێک بوو ئەنوێژی کرد ئەڕۆژووشی گرت چووە ناو بەهەشتیش پاشان هەر خۆی دەیگوت ئەمە عەمری کوڕی ثابت بوو (ئنجا بەخششی خودای گەورە لەمەیدانی عەقل بەدەرە حەوالەکردنی گەیشتن بەئامانجەکان چی دونیایی و چی ئایینی وەباڵ تەدبیرو خۆماندوکردنی زۆر غەڵەتە).

٧١٨: عَن اَنَسٍ (ض) يا اُمَّ حارثَةَ إنَّها جِنانٌ في الجنَّةِ وَإنَّ ابنَكَ أصابَ الفِردَوسَ الأعلى.

### تەرجەمە

٧١٨: دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی روبەیعی کچی نەضری کوڕی ضەمضەم باوکی باپیری ئەنەس بووە چونکی ئەنەس کوڕی مالک کوڕی نەضر کوڕی ضەمضەم بوو. دایکی حارثەی کوڕی سوراقە کە خوشکی باوکی من بوو یەعنی پووری بوو. هاتە خدمەت پێغەمبەر (د) بەپێغەمبەری گوت ئەی پێغەمبەری خودا تۆ قسەیەک بۆ من لەلایەن حارثەی کوڕی خۆم بۆ ناکەی -چونکی لەغەزای بەدر تیرێکی پێ کەوت نەزانرا لەکوێوە هات وە کێ هاویشتی) شەهید کرا. چونکی لای وابوو کوڕی نەگەیشتوەتە دەرجەی شەهید بوون. -چونکی تیرێک بەبێ زانینی قەصدی دوژمن کەبۆی باوێ پێ‌ی کەوتبوو بۆیێ ئەم پرسیارەی لە پێغەمبەر کرد. ئەگەر بیزانیبوایە کوڕی شەهیدە دەی زانی حالی شەهیدان چۆنە. ئەگەر بزانم گەیشتۆەتە دەرەجەی شەهید بوون کە بەهەشتە خۆم ڕادەگرم ناگریێم عاجزیش نابم. وە ئەگەر بشزانم لایێکی ترە بەبێ ڕەوەستان بۆیدەگریم. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەێ دایکی حارثە بەڕاستی پلەو دەرەجەکانی هەیە لەبەهەشت وە کوڕی تۆ گەیشتە سەرەوەترین بەهەشت کە (جنة الفردوس)ە «ئنجا لەخدمەت پێغەمبەر (د) گەڕاوەو پێ دەکەنی دەیگوت بخ بخ ئەی حارثە» واتە باشە باشە بۆ تو ئەی حارثە.

٧١٩: عَن عائشة (ض) (فَأينَ) بعدَ ماقال له جبريلُ وَضَعْتَ السلاحَ فوَاللّهِ ماوَضَعْتُهُ.

### تەرجەمە

٧١٩: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکو پێغەمبەر (د) گەڕایەوە لەخەندەق لەغەزای ئەحزاب لەساڵی چوارەمی هیجری چەکو ئامێری شەڕی لەخۆ کردەوە وەخۆی شووشت. جوبرائیل هاتە لای دیتی توزو گەرد عەمامەی پێغەمبەری داپۆشیوە پێ‌ی گوت تۆ چەکو ئامێری شەڕت دانا نا سوێند بەخودا من چەکو سیلاحی خۆم دانەناوە پێغەمبەر (د) فەرمووی ئیتر بۆ کوێ. گوتی بۆ ئێرە. ئیشارەی بۆ بەنی قورەیظە کرد ئنجا پێغەمبەر (د) بۆ سەر بەنی قورەیظە چوو سەریش کەوت بەم تەرزە ئەگەرچێ بەنی قورەیظە عەشیرەتێکی بەهێز بوون پیاوەکانی شەڕکەریان هەموو کوشت. ئەوانی تریشیان ئەسیر کرد خاکەکەشیان هەمووی لەموهاجیران دابەش کرا.

٧٢٠: عَن أبي هريرة (ض) يضحكُ الله الى رَجُلَيْنِ يقتُلُ أَحَدُهما الآخَرَ يَدْخلان الجنَّةَ يقاتِلُ هذا في سبيل الله فيُقتَلُ ثمَّ يتوبُ على القاتِلِ فيُسْتَشْهَدُ.

### تەرجەمە

٧٢٠: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) فەرمووی خودای گەورە بەدوو پیاوێ پێ دەکەنی یەعنی بەتەواوی رازی بوون ڕوویان تێ دەک پرسیارکرا چلۆن ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی پیاوێکی موسولمان لەگەڵ کافر لەڕێگای خودا کوشتار دەکا موسولمانەکە شەهید دەکرێ پاشان کافرەکەش موسولمان دەبی وە تۆبەی لێ قبوول دەکاو دەچیتە غەزا و شەهید دەکرێ.

٧٢١: عَن أَنَسٍ (ض) اللّهُمّ ان العيش عيشُ الآخِرَةِ فاغفِرْ لِلأنصارِ والمُهاجِرَه فَقالوا مُجيباً له. نحنُ الذينَ بايعوا محمداً على الجِهادِ مابَقينا أبَداً. عَنَ أنَسٍ اللّهُمَّ لاخيرَ الاَّ خير الآخرة. مباركٌ في الانصار والمُهاجِره.

### تەرجەمە

٧٢١: دەگێڕنەوە لە ئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) تەشریفی چووە دەرێ بۆلای خەندەک لەغەزای ئەحزاب لەساڵی پێنجەمی یا چوارەمی هیجریدا کە بە ئیشارەی سەلمانی فارسی ئەمری فەرموو بوو لەدەورەی مەدینە خەندەک لێ بدەن ئنجا وەکوو دیتی موهاجیرو ئەنصار لەسبەینەیەکی سارد- خەریکی هەڵکەندنی خەندەکن دیتیشی زۆر ماندوو بوونەو برسیشن هیچ عەبدو نۆکەریکشیان نەبوو لەبەر دەست کورتی یان لەو وەقتە کە ئەم تەرزە ئیش و کارانە بەوان بکەن هەر بە خۆیان ئیش و کاری خۆیان دەکرد. ئنجا بۆ هاندانیان لەسەر ئەم کارەیان کە هۆی جهادبوو پێغەمبەر (د) ئەم شیعرەی عبداللەی کوڕی ڕەواحەی بۆ خوێندنەوە [اللهم ان العیش...الخ] موهاجیرو ئەنصاریش وەلامی پێغەمبەریان داوە بە بەیتی سێیەم [اللهم لاخیر الا خیر الاخرە] یەعنی ئەی خودایا هیچ چاکەیەک نی‌یە چاکەیەک نەبی کە بۆ قیامەت بی ئنجا خیرات و بەرەکەت بخە ناو ئەنصارو موهاجیران لەدین و لە دونیاو ڕەزای خودای لەئێمەو لەوانیش بی.

٧٢٢: عَنِ البَراءِ لولا انتَ ما اهتدينا ولا تصدَّقنا وَلا صلَّيْنا فأنزِلِ السكينَةَ عَلَينا وثبِّت الاقدامَ إن لاقَيْنا انَّ الأُولى قد بَغَوا عَلَيْنا إذا ارادوا فتنَةً أبينا.

## تەرجەمە

٧٢٢: دەگێڕنەوە لەبەرائی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەرم دیت ڕۆژی ئەحزاب خۆلی لەخەندەک فڕە دەدا خۆڵ سپیاتی زکی داپۆشیبوو ئەم قسانەشی دەفەرموو لولا انت...الخ یەعنی ئەی خودایا ئەگەر چاکەی تۆ نەبوایە نە لەسەر دینی ئسلام دەبووین وەنە صەدەقەو زەکاتمان دەدا وە نەنوێژمان دەکرد ئنجا ئازایی و سەرکەوتنمان بۆ بنێرە هێزیکی دیان بۆ بنێرە وە قاچەکانمان ڕابگرە لەمەیدانی کوشتار وەکوو تووشی یەکتری هاتین لەگەڵ کافران چونکی ئەو کەسانەی کە ستەمیان لەئێمە کرد کە قورەیشن وەکوو بیانەوێ ئێمە تووشی فتنەو کفر بکەن ئێمە نایکەین. ئەگەر لەشێوەی ڕەخنەبگوترێ ئەمانە شیعرن دەلێن ئەمانە هیچیان شیعر نین لەسەر قەواعیدی عیلمی عروض بۆیێ زەرکەشی گوتیتی ئەگەر شیعر بوایەو مەوزون بوایە دەیگوت [لاهم یاخۆ تاالله لولا انت ما اهتدینا]. پاشان [ان الاولی] ئەو نەختە مەوزون بوو بلێ [ان الاولی هم قد بغوا علینا]. بەلام لەبەر ئەوەی فەصاحەتە بەهێزەکەی خودا کە بەوی دابوو دانە گەوهەرەکانی عادەتیشی کە لەدەمی پیرۆزی هاتووەو گوتراوە ئەگەر وەکوو ئەبیاتی مەوزونە خۆی نواندبی عەجیب نەبووە هەندێکیش وایان وەلام داوەتەوە ئەمانە هەمووی شیعرەکانی عبدالله کوڕی ڕەواحە بووە بەمەثەل گوتیتی. یەکێک لەوان - شرقاویە ج٢ ص٣٠٢ بەلام قسەی زەرکەشی‌یە چونکی شیعر نین.

٧٢٣: عَن أنَسٍ (ض) إنَّ أقواماً بالمدينةِ خَلَّفْنا ما سَلَكْنا شِعباً ولا وادياً الاَّ وهُم مَعَنا فيه حَبَسَهُمُ العُذْرُ.

## تەرجەمە

٧٢٣: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی لە غەزای تەبووک پێغەمبەر (د) فەرمووی بەڕاستی چەند قەومێکمان لەمەدینە جێ هێشتووە لەپاش خۆمان لەهیچ دۆڵە چیایەک نەڕۆیشتینە یاخۆ لەبەینی هیچ دوو کێوان ڕەت نەبووینە. ئیلا مەگەر ئەوان لەگەڵ ئێمە دابووینە، لەم جێگایانە. دەربارەی پاداشت پێیان گوت ئەی پێغەمبەری خودا چلۆن ئەوان لەگەڵ ئێمەدا بووینە ئەوان لە مەدینەن فەرمووی عوزری ناساغی و نەتوانینیان بەهەلستان بەشەڕکردن دژی کافران. ئەوانی بەند کردووە.

٧٢٤: عَن أبي سعيدٍ (ض) مَن صامَ يوماً في سبيل الله بَعَّدَ اللَّهُ وجْهَهُ عَنِ النّارِ سَبْعينَ خَرِيفاً.

**تەرجەمە**

٧٢٤: دەگێڕنەوە لەئەبی سەعیدی خودری ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرموویەتی هەرکەسێک یەک ڕۆژ بەرۆژوو بێ لەجیهاد خودا حەفتا ساڵ لەئاگری بەدوور دەخاتەوە بەلام بەم مەرجە بەهۆی ڕۆژوو بێ تاقەت و زەعیف نەبی لەجیهاد چونکی هەم چاکەی ڕۆژوو هەم چاکەی جهادی بۆ دەبی بەلاّم بۆ کەسێک بێ تاقەت ببی بەرۆژوو: شکاندنی ڕۆژوو باشترە.

٧٢٥: عَن زيد لبنِ خالدٍ (ض) مَن جَهَّزَ غازياً في سَبيل اللّهِ فَقَدْ غَزا وَمَنْ خَلَّفَ غازِياً في سَبيلِ اللّهِ بِخَيرٍ فَقَدْ غَزا.

**تەرجەمە**

٧٢٥: دەگێڕنەوە لەزەیدی کوڕی خالد ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسێک ئەسبابی سەفەرو ئەسبابی کوشتار بۆ موجاهیدێک ساز بدا لەڕێگای خودای گەورە بەڕاستی غەزای کرد بۆ ئەوەی بگاتە پاداشت با لەڕاستیشدا شەڕکەر نەبێ لەپاداشت و چاکەی کوشتار لەگەڵ کافران وەکوو یەکن. وە هەرکەسێکیش چاوەدێری شەڕکەرێک بکا لەڕێگای خودا واتە یارمەتی ماڵ و منداڵی بدا بەچاکە نەک بەمەبەستێکی تر بەڕاستی غەزای کرد یەعنی لەگەڵ موجاهیدەکە وەکوو یەکتر نیە لەپاداشت و خێر.

(ش): ئەگەر پرسیار بکرێ ئایا ئەگەر کەسێک شەڕکەرێک ئامادە بکا ئاگاشی لەماڵ و منداڵی ببێ پاداشتی یەک شەڕکەری هەیە یا پاداشتی دوو شەڕکەری هەیە. ابن ابی جەمرە وەلامی داوەتەوە پاداشتی دوو شەڕکەری هەیە چونکی ئەوەی لە مەعنای حەدیث دیارە. ئامادەکردنەکە کارێکی سەربەخۆیە خێری شەڕکەرێک دەگەیەنی ئاگالێ بوونیش لەماڵ و منداڵی موجاهید خێری شەڕکەرێک دەگەیەنی: میهرەبانی فرەوانی خوداش چەندی بلێ‌ی دەگەیەنی.

٧٢٦: عَن أنسٍ إنّي أرحمها قُتِلَ أخوها.... معي.

**تەرجەمە**

٧٢٦: دەگێڕنەوە لەئەنەس کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) بۆلای دایکەکانی ئیمانداران نەبێ بۆ هیچ خانوێک لە مەدینە نەدەچوو هەندەی خانووی

ئومی سولەیم (کەدایکی ئەنەس بوو) پێ‌یان گوت بۆچی زۆر دەچی‌یە مالی ئومی سولەیم دلم بە ئومی سولەیم دەسووتێ چونکی حەرامی کوڕی مەلحانی برای ئەو لەبیری مەعونە لەعەسکری مندا شەهید کرا (لەفظی معی یەعنی فی عسکری) چونکی پێغەمبەر (د) خۆی تەشریفی ئامادەی بیری مەعونە نەبوو شەهید بوونی حەرامی کوڕی مەلحان لەحەدیثی (٧١٣) ڕەت بوو.

(ش): تەحلیلی کرمانی بۆ دروست بوونی چوونی پێغەمبەر بۆ ئەو مالە -مالی- سهلەی ئومی سولەیم بەمە کە خوشکی دایکی رضاعی بوون - واتە پێغەمبەر شیری لەگەل دایکی ئەم ئافرەتە خواردوبوو- یەعنی پلکی رضاعی بووە.

لەم حەدیثە وەردەگیری دروست بوو بەتەنیایی ئەو لەگەل ئافرەتی بێگانەش چونکە پێغەمبەر مەعصوم بوو، (واتە پاک و پارێزراو بووە لای خودا) پێویستیشە چاوەدێری و یارمەتی مال و مندالی -غازی- واتە شەڕکەر لەرێگەی خودا- لەپاش مردنیش.

**٧٢٧: عَن جابر مَنْ يأتيني بِخبر القَومْ يَومَ الأحْزابِ فقالَ الزُّبَير انا ثمُّ قالَ مَن يأتيني بخبر القوم فقالَ الزبيرُ أنا. اِنَّ لِكل نبيٍّ حوارياً وَحوارِيَّ الزّبيرُ.**

### تەرجەمە

٧٢٧: دەگێرنەوە لەجابری کوڕی عبداللە ئەنصاری ڕەزای خودایان لێ بی گوتی لەغەزای ئەحزاب یەعنی لەو غەزایەی کە جۆرەها عەشائری جۆر بەجۆرو قورەیشی مەکە بە ڕێک کەوتن هاتنە سەر مەدینە پێغەمبەریش (د) خەندەکی لێدا لەدەورەی مەدینە خەبەر گەیشتە ئەصحاب کە بەنی قورەیظە موعاهەدەی خۆیان هەلوەشاندووەتەوە لەگەل ئیسلام بووینە لای قورەیش لەدژی ئیسلام ئنجا بۆ تەحقیقی ئەم خەبەرە پێغەمبەر (د) فەرمووی کێ خەبەری بەنی قورەیظەم بۆ دەینی زوبیر گوتی من جارێکی تریش وای فەرموو دووبارە زوبیر گوتی من فەرمووی بەڕاستی بۆ هەر پێغەمبەرێک لەقەومی خۆی کەسێکی دلسۆزو پاک هەبووە -ئەوەی تایبەت و دلسوزی منیش بی زوبەیرە.

(ش): ئنجا ئەم ناردنی زوبەیر غەیری ناردنی حوذەیفە بوو چونکی ناردنی زوبەیر بۆ تەحقیقی هەلوەشاندنەوەی موعاهەدە بوو. پاشان وەکوو موحاصەرە بەشیدەت بوو لەسەر موسولمانان بەسەبەب خەندەک و عەشیرەتەکانی جۆر بەجۆر قورەیشیش کۆبوونەوە لە دەورپشتی خەندەک پاشانیش ناخۆشی و ڕک لێ بوونەوە لەبەینی عەشیرەتەکان پەیدابوو. خوداش بایەکی توندی ناردنە سەری لەشەوێکی سارد ئەوکاتەش پێغەمبەر

فەرمووی کێ بی خەبەری بەنی قورەیظەم بۆ بێنی دووجار حوذەیفە گوتی داواکەی پێغەمبەر دووبارە بۆوە بەڵام ناردنی زوبەیر لەپێش ناردنی حوزەیفە بوو. ئنجا با واتێ نەگەن کە ئەم حەدیثە دەرحەق بەزوبەیر نەبووە دەرحەق بە حوزەیفە بووە.

**٧٢٨: عَنْ عُرْوَةَ البارقيِّ (ض) الخيلُ مَعقودٌ في نواصيها الخيرُ الى يَومِ القيامَةِ الأجْرُ والمَغْنَمْ.**

### تەرجەمە

٧٢٨: دەگێڕنەوەی لەعەروەی کوڕی ئەبو جەعدەی بارقی ڕەزای خودای لێ بێ گوتی پێغەمبەر(د) فەرمووی بەناوچاوانی وولاغی سواریەوە گرێدراوە خێرو چاکە هەتا ڕۆژی قیامەت. یەکی یان خێری قیامەت کەپاداشتە. دووەم خێری دونیا کە ماڵ و غەنیمەتە. لەفظی (الخیل) گشتیـیە بەڵام مەبەست ئەسپی ڕاگیراوە بۆ کاری باش و مەشروع چونکی لەمەپێش ڕەت بوو. وولاغ بۆ سێ کەسە یاخۆ مەبەست جنس وولاغە پاشان ئەگەر کەسێک وولاغ ڕابگری بۆ کاری چاکە نەبێ خراپیەکەی لەبەر کارێکی لابەلایە لەبەر وولاغەکە خۆی نیـیە.

**٧٢٩: عَن انسٍ (ض) البَرکةُ في نَواصي الخَیْلِ.**

### تەرجەمە

٧٢٩ دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بێ فەرمووی زیادبوونی ماڵ و کەلکی دونیا و پاداشتی قیامەت لەناوچاوانی وولاغی سواریە.

(ش) ابن عبدالبر گوتیتی لەم حەدیثانەدا بەگەورە زانینی وولاغ هەیە لەسەر گیاندارانی دیکە بۆیی نسائیش ریوایەتی کردووە لەئەنەس گوتی هیچ شتێکی دونیا لەپاش نافرەتان لای پێغەمبەر(د) خۆشەویستر نەبووە لەوولاغ. دەگێڕنەوە وەکوو دوو لەشکر بگەنە یەکتری وولاغ دەڵێ سبّوحٌ قدّوسٌ ربّ الملائکةِ والرّوح لە هەموو حەیوانێک زیاتر دەبەزی لەڕۆیشتنیدا دەعیە هەیە وە لە طەبیعەتیشدا کەیف خۆشیەک هەیە خاوەنیشی خۆش دەوێ.

٧٣٠: عَن ابي هريرة (ض) مَن احتبسَ فرَساً في سبيل الله إيماناً باللّهِ وتصديقاً بوَعده فأنَّ شبِعَهُ وَرِيَّه ورَوْثَهُ وَبولَهُ في ميزانِهِ يَومَ القيامةِ.

## تەرجەمە

٧٣٠: دەگێـڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خـودای لێ بێ پێـغـەمـبـەر(د) فـەرمـووی هەرکەسێک ڕابگری وولاغێکی سواری بەنی‌یەتی جیـهـاد لەڕێگای خودا نەک بۆ شانازی پێ‌کـردن و جـوانی تەنـیـا بۆ خـودا وەلەبەر گـوێ ڕایەڵی بۆ فـەرمـانی خـودا وە باوەڕی بەوەعـدەی خـودا بەپاداشت بەڕاسـتی ئەو ئالیـکی کـەپێ تێـر دەخـوا وە ئەو ئاوی کـە دەیخواتەوە پێ تێر دەبێ وە ئەو تەرسو میزەی کەدەیکا لەناو تەرازووی ئەوکەسەدایە ڕۆژی قیامەت. بۆنیشی وەکوو مسکی خالص خۆشە وەکو تـەرسی وولاغی دونیا نیە. هەروەکوو لەحـەدیثی ابن سـعـد هاتووە.[المنفِقُ على الخيل كباسط يديه بالصَدَقَةِ لايَقبِضُها وأبْوالُها وأرْواثُها عِندَ الله يومَ القيامةِ كذكيّ المِسكِ].

٧٣١: عن مَعَاذٍ (ض) وَهَلْ تدري ما حَقُّ اللهِ على عبادِه وَماحقُّ العِبادِ على اللّه. قالَ فأنَّ حقُّ الله على العِبادِ ان يعبدوه. ولايُشرِكوا به شيئاً وَحقُّ العِبادِ على الله ان لايعذِّبُ من لايُشرِكُ به شيئاً فقلتُ يا رسول اللّهِ افَلا أُبَشِّرُ بِهِ الناسَ. فقالَ لاتُبشِّرْهُمْ فيَتكِلوا.

## تەرجەمە

٧٣١: دەگێـڕنەوە لەمـەعـازی کـوڕی جـەبەلی ئەنصـاری ڕەزای خـودای لێ بێ گـوتی پێغەمبـەر(د) گوێ‌درێژێکی هەبوو ناوی عوفەیر بوو مقوقەسی ملکی مصر بەدیاری بۆی ناردبوو گـوێ‌درێژیکیـشی هەبوو ناوی (یەعفور) بوو فـروەی کوڕی عـەمر بۆی ناردبوو لای هەندەکانیش بەپێچەوانەیە ئنجا پێغەمبەر(د) لەپشت خۆی منی سـواری (عوفەیر) کردبوو فـەرمـووی ئەی مـەعـاذ ئەرێ تۆ دەزانی حـەقی خـودا لەسـەر بەندەکـانی چی‌یە حـەقی بەندەکانیش لەسەر خودا چی‌یە گوتم خوداو پێغەمبەری خودا دەزانی فەرمووی حەقی خودا لەسـەر بەندەکـانی ئەمـەیە بێ پەرستن هیچ شـریـک و هاوبەشی بۆ پەیدانەکـەن حـەقی بەندەکانیش لەسەر خودا عەزاب نەدا ئەوکەسەی هیچ شتێکی نەگێڕابێ بەشریکی خودا. منیـش پێم گـوت ئەی پێـغـەمـبـەری خودا ئەم مـوژدەیە بەخـەلکی ڕانەگەیەنم فـەرمـووی نا مـوژدەیانی پێ مەدە ئەگـەر نا لەسـەر ئەمەندە اعـتـماد دەکـەن. لەخوا پەرسـتی‌تر سسـتی دەکەن.

٧٣٢: عَن انسٍ (ض) ماراينا مِن فَزَعٍ وإنْ وَجَدْناه لبَحراً.

## تەرجەمە

٧٣٢: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بێ گوتی شەوێک ترسێک لەمەدینە پەیدابوو ئیمەش ولاغێکی سواریان هەبوو پێغەمبەر(د) بەئەمانەت ولاغەکەی لێ خواستین تەشریفی سوار بوو بەولاغەکە دەگوترا (مەندوب) پاشان وەکوو لەدەرەوەی مەدینە گەڕاوە فەرمووی (هیچ ترسێکمان نەدیت) یەعنی ئەمین بن خۆتان ناڕاحەت مەکەن وەئەم ماینەشم نەدیت ئیلا مەگەر لەغارو ڕەهوانی وەدەوامی لەسەر خۆش ڕۆیشتن نەبێ هەروەکو بەحر بوو.

(ش): ئەنەس گوتی ئەم ولاغەمان زۆر هیشکەڕۆ بوو لەپاش سواربوونی پێغەمبەر(د) بەقەطعی نەدەگیرا پێغەمبەر(د) بیستوچوار ولاغی سواری هەبوو، هەریەکێکیش ناوێکی تایبەتی هەبوو. هیسترێکی هەبوو ناوی (دلدل) بوو دوو ووشتری سواریشی هەبوو یەکیان ناوی (قصوا) بوو ئەویتریان عَضبَا بوو: لەم حەدیثە وەردەگیری حەیواناتی مالی هەریەکیکیان ناوێکی تایبەتی هەبێ سونەتە.

٧٣٣: عَن ابنِ عُمَرَ (ض) إنّما الشُّؤْمُ في ثَلاثَةٍ في الفَرَسِ والمرأةِ وَالدّارِ.

## تەرجەمە

٧٣٣: دەگێڕنەوە لەعەبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بێ پێغەمەر(د) فەرمووی بەدی و مەنحوسی لەسێ شت دێتەجێ یەکیان: لەوولاغ. ئەگەر بە نیەتی باش ڕانەگیری وەغەزای پێ نەکرێ یاخۆ چەمووش بێ. دووەم: (ژن) نەزۆک بێ وەقانعە نەبێ (واتە بەژیانی مێردی ڕازی نەبێ) وە دڕبێ لەسەر مێردەکەی (واتە هەرکات شەڕە چەقەی بێ لەگەڵ مێردەکەی ژیانی لێ تاڵ بکا). سێیەم: خانوو ئەگەر دراوسێی خراپت هەبێ وەتەنگ بێ و دووربێ لەمزگەوتان بەم تەرزە گوێت لە دەنگی بانگ نەبێ ابنی عەرەبی- واتە شیخ محی‌الدین العربی- گوتیتی خێرو شەڕ بەحوکم وقەزای خودایە بۆ ئەمانە تەئسیرێک نی‌یە بەڵام ئەمانە دەبی بەجێگاو شوێنی خێرو شەڕی تەقدیرکراو.

٧٣٤: عَن البراءِ: أنا النبيُّ لاكَذِبْ انا ابنُ عَبدالمطَّلِبْ.

### تەرجەمە

٧٣٤: دەگێڕنەوە لەبەرانی کوڕی عازب ڕەزای خودای لێ بێ پیاوێک گوتی ئەرێ ئێوە ڕاتان کرد پێغەمبەرتان بەتەنها بەجێ هێشت لەغەزای حونەین کە لە سالی هەشتەمی هیجری ڕوویدا. بەراء گوتی بەڕاستی ئێمە هەلاتین بەلام پێغەمبەر هەلّ نەهات. هۆی هەلاتنمان ئەمەبوو عەشیرەتی هەوازن کە عەشیرەتێکی زۆر بوون. ناسراوبوون بەتیرەندازی باش وە ئێمەش وەکوو شالاومان بردنە سەری ئەوان شکان ئێمەش گرفتاری تالان کۆکردنەوە بووین. ئەوانیش لەوکاتەی کە ئێمە تالانمان کۆدەکردەوە فرسەتیان دەستکەوت بەتیرباراندن بایان داوە سەر ئێمە موسولمان هەلاتن پشتیاندا بەلام پێغەمبەر پشتی نەدا بەڕاستی خۆم دیتم سواری هێسترێکی سپی بوو ئەبوسفیانی کوڕی حەرثی مامی جەلەوی هێسترەکەی گرتبوو پێغەمبەریش دەی فەرموو [أنا النبيُّ لاكَذِبْ انا ابنُ عَبدالمطَّلِبْ].

واتە: من بێ درۆ لەلایەن خودا ناردراووم بۆ عالەم. کەسێکیش لەلایەن خودا ناردرابێ چونکی خودا هەر سەری دەخا زەلیلی دوژمنی ناکا ئنجا چلۆن ڕاکردن تەصوور دەکرێ لەمن. (یەکێکی تریش) من کوڕی پیاوێکم کە عبدالمطلب بوو لەدونیا ناسراو بوو بەصفەتی کە ئازایی و مرۆڤایەتی‌یە. خۆ هەلاتن لەو خەیالّ نەدەکرا غەیری خۆڕاگرتن لەبەرامبەری دوژمن نەبێ. کەوایە لەمنیش خەیالّ ناکرێ. ئەگەر بگوترێ ئەمە شیعرە فەرموویتی جوابی ئەم اعتراضە لەمەپێش لەحەدیثی ئەنەس و بەراء رەت بووە کە ئەم فەرموودە تەصادوفی بووە بەقەصدو نیەت نەبووە ئنجا نابێتە شیعر گوتن.

٧٣٥: عَن أنَسٍ (ض) حقٌّ عَلى اللّهِ أنْ لايَرتفِعَ شئٌ مِن الدنيا إلاّ وَضَعَهُ.

### تەرجەمە

٧٣٥: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) ووشترێکی هەبوو ناوی (عەضبا) بوو لەبەر خۆشبەزی نەدەگیرا عەرەبێک هات سواری ووشترێکی جوان و تازە عومر ببوو مەدحی ووشتری خۆی دەکرد ئەصحابیش مەدحی عەضبایان کرد تۆشمەیان پێ کردن عەضبا پاش کەوت ئەصحاب زۆریان پێ ناخۆش بوو بەپێغەمبەریان گوت فەرمووی ئەمە ئەریتەکە خودا داپناوە کە هیچ شتێک بلند نەبی لە دونیا مەگەر دەبی

هەر نوی بکا لەپاش بلندبوونی یەعنی هەتا ئێستا عەضبا لەبلندیو بەرزبوون دابوو خودای گەورە عادەتی خۆی تیا جاری فەرموو نەوی بوو ئنجا ئەی ئەصحاب پێتان ناخۆش نەبی و بشزانن هیچ حالێک لەهیچ شتێک لەدونیا لەیەک قەرار نامینێ ئەساسی ئەم عالەمە لەسەر بەدوایەکداهاتنی ڕووداوەکانی جیهانە.

٧٣٦: عَن عائِشَة (ض) لَيْتَ رَجُلاً مِنْ أَصحابي صالحاً يَحرُسُني اللّيْلَة إذْ سَمِعْنا صَوْتَ سِلاحٍ فقالَ مَنْ هذا فقالَ أنا سعدُ ابنَ ابي وَقاصٍ جِئْتُ لاحْرُسُكَ. وَنامَ.

**تەرجەمە**

٧٣٦: دەگێرنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەمەککە لەپێش زەمانی هیجرەت بەشەو هەشیار دەبوو وەکوو چووە مەدینە فەرمووی کاشکی لە ئەصحابەکانم پیاوێکی باش هەبوایە ئیمشەو نۆبەتی لێ بگرتمایە. لەناکاو دەنگی چەک و سیلاحمان گوێ لێ بوو پێغەمبەر (د) فەرمووی تۆ کێ‌ی گوتی من سەعدی کوڕی ئەبی وقاصم. هاتووم نەوبەتت لێ بگرم پێغەمبەر نووست.
لەم حەدیثە واتێ دەگەین نۆبەتْ گرتن لەفەرماندارو پیاوی گەورە بەگوێرەی حال کارێکی دروستە بەلام ئەگەر هەر بۆ خۆ بەگەورە زانین نەبێ.

٧٣٧: عن أَبي هُرَيْرة (ض) تَعِسَ عبد الدّينار وَ عَبْد الدِّرْهم وعبدُ الخَميصَةِ إنْ أُعطِيَ رَضِيَ وإنْ لم يُعطَ سَخِطَ. تَعِسَ وانتكَسَ وَاذا شيكَ فَلاَ انتقَشَ طوبى لِعَبْدٍ اَخَذَ بعِنانِ فَرَسِهِ في سَبيل اللّه. اشْعَثَ رَأْسُهُ. مُغبَرَةٌ قَدَماهُ اِن كانَ في الحراسَةِ كانَ في الحراسَة وإن كان في السّاقَةِ كانَ في السّاقَةِ. إن اِستَأْذَن لم يُؤذَن لَهُ وانْ شَفَعَ لم يُشفَّعْ.

**تەرجەمە**

٧٣٧: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی لەسەر ڕوو بکەوی و بەهیلاک بچی عەبدی دینارو عەبدی درهەم وە عەبدی جلکی ئارمووش ئەگەر مالی پێ بدرێ و دەولەمەند بکرێ ڕازیە لەخودای گەورەو ئەگەر پێشی نەدرێ ناڕازیە بەوەندی بۆی داندراوە. هەی بەهیلاک بچی و خێر لەو مالە نەبینی بەهۆی تووش بوونی بەبەلایان وە بەسەری دا برمێ وە ئەگەر دڕکیشی بچیتە ناو قاچی یا جیگاییێکی تر

دەرنەچی: واتە کەسێک کە ڕازی نەبێ بەوەندەی کە خوا بۆی داناوە وە بۆیەش خودا بپەرستی هەتا لەدونیا دەولەمەندی بکاو دینارو درهەم و جلکی ئارمووشی زۆربی موستەحەقی دوعا لێ کردنە چونکی خوا پەرستیەکەی بۆ ئەمانەیە بۆ ڕازی بوونی زاتی خودای گەورە نی‌یە خۆشیەکانی بەهەشت بۆ کەسێکە جەلەوی وولاغی خۆی بگری لەغەزا لەرێگای ڕازی بوونی خودا بەگرژی و تێک ئالاوی مووی سەری لەبەر بێ چەوری وە بەقاچەکانی تۆزاوی. ئەگەر لەنۆبەتدابی لەپێشەوەی لەشکر لەترسی هێرشی دوژمن ئەو بەردەوامە لەنۆبەتی خۆی وە ئەگەر لەدامەنی لەشکریش بی. ئەوا بەردەوامە لەسەر کاری خۆی لەدامەنی لەشکر. لەبەر فەقیر حالی خۆشی ئەگەر ئیزن بخوازی کە بچیتە ناو قەوم ئیزن نەدرێ وە ئەگەر تکایەکیش بۆ یەکێک بکا تکای ڕانەگیرێ. یەعنی ئەم تەرزەکەسە ئەگەرچی لای خەلک بێ قیمەتە بەلام لای خودا زۆر بەرێزو بە پایەو نرخە. بەلام ئەو دەولەمەندانەی کە دینارو درهەموو ئارمووش و خۆشی‌یەکانی دونیا دەپەرستن ئەگەرچی لای خەلکی لەدونیا بەرێزن بەلام لای خودای گەورە زۆر بێ ڕێزن. «بەلام ووشەی (خمیصة) بەواتەی بەرگێکی چوارگۆشەی دروست کراوە قوماشەکەی نەخشینراوو خەت خەتە».

٧٣٨: عَن اَنَسٍ (ض) هذا جَبَلٌ يُحبُّنا وَنُحِبُّهُ.

**تەرجەمە**

٧٣٨: دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەسالی شەشەمی هیجری لەخدمەت پێغەمبەر (د) دەرکەوتم بۆ غەزای خەیبەر وەکوو پێغەمبەر گەڕاوە بۆ مەدینە. کێوی ئوحودی لێ بەدیارکەوت فەرمووی ئەوە کێوی ئوحودە ئێمەی خۆشدەوێ بەخۆش ویستنێکی تەواو. وە ئێمەش ئەومان خۆشدەوێ. ئەگەر بگوترێ خۆشەویستی چلۆن تەصور دەکرێ لەکێو کە جەستەیەکی بێ گیانە دەلێین ئەمە مۆیدە بەگریانی ئەستوندەی مزگەوت کە لەدارخورما بوو لەبەر جودابوونەوەی پێغەمبەر لێ‌ی کە لەحەدی تەواتر بەدەر ئەصحابی بەرێزی پێغەمبەر شاهیدی یان لەسەر داوە بەهەلبەست. وەکوو شاعیر دەلێ:

[وَحنَّ اليكَ الجِذعُ حينَ تركتَهُ
حَنينَ الثكالى عندَ فقدِ الأحِبَّةِ]

یەعنی: بەجۆش بۆتو گریا دارخورما وەکوو بەجێت هێشت وەکوو گریانی بەجۆشی ژنی منال مردوو لەکاتی جودابوونەوەی خوشەویستان. ئنجا وەکوو گریانی داری بێ ڕوح

دەرحەق بەخۆشەویستی خودا ثابت بێ.

بۆچی خۆشەویستی کێوی بێ ڕووحیش دەرحەق ئەو تەصەور ناکرێ و موحەقەق نی‌یە.

**٧٣٩: عَن اَنَسٍ (ض) ذَهَبَ المُفطِرونَ اليَومَ بِالأجَر.**

### تەرجەمە

٧٣٩: دەگێڕنەوە لەئەنەس ڕەزای خودای لێ بی گوتی ئێمە لەسەفەرێک لەڕۆژێکی گەرم لەخدمەت پێغەمبەر بووین زۆر سێبەرمان بۆ خۆمان پەیداکرد. پیاو هەبوو جلکی خۆی دەکردە پەنا لەگەرمایی ڕۆژ پیاو هەبوو بەدەستی خۆی سێبەری لەخۆی دەکرد. بەشێکیش لەئێمە بەڕۆژووبوون بەشێکیش بێ ڕۆژووبوون. ئەوانی بەڕۆژووبوون لەبەر بێ تاقەتی هیچیان ئیشیکیان نەکرد بەلام ئەوانەی بەڕۆژوونەبوون، هەموو ووشترەکانی سواریان بردە سەر ئاو وە خدمەتی بەڕۆژوەکانیان کرد چارەی ئاوو ئالیکیان بۆ کردن. پێغەمبەر (د) فەرمووی: ئیمرۆ ئەوانەی بێ ڕۆژووبوون خێروچاکەی زۆر گەورەیان برد واتە خێرو چاکەی ئەوەی کە سێبەریان لەبە ڕۆژووان کرد وە ئاوو ئالیکیان بەووشترەکانیاندا.

دووەم: وە ئەوەندەی ڕۆژووگرەکان باداشتیان پێ برا: چونکە لەسایەی ئەوان بەڕۆژوەکان حەسانەوە لەماندووبوون بەئیش و کاری خۆیان.

**٧٤٠: عَن سَهل ابن سعدِ السّاعِديّ (ض) رِباطُ يَومٍ في سَبيلِ اللّهِ خيرٌ مِن الدُّنيا وَمَا عَلَيْها ومَوضِع سَوْطِ اَحدِكُمْ مِنَ الجنَّةِ خَيرٌ مِنَ الدُّنيا وَما عَلَيْها وَ الرَّوحَةُ يَروحُها العَبْدُ في سَبيل اللّهِ اَوِ الغَدْوَةُ خَيْرٌ مِنَ الدّنيا وَ ماعَلَيها.**

### تەرجەمە

٧٤٠: دەگێڕنەوە لەسەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر ڕۆژێک لەسەر سنووری وولاتی ئیسلام ئێشک بگری بۆ پاراستنی لایەکی وولاتی ئیسلام لەڕێگای خودای گەورە. باخەلکی ئەو سنوورەش بی بەلام مەبەست ونیەتی لەمانەوەکەی دەرکردنی دوژمن بێ لەوولاتی ئیسلام بۆیێ زۆر لەپیاوە باشەکانی پێشوو ئەمەیان هەلبژاردووە لەسەر سنووران جێ نیش بوون: ئەمەیان باشترە لەهەرچی خۆش و نیعمەتێکی کە لەدونیادا هەیە: بۆ ئەوکەسەی دونیای هەیەو نیعمەتەکانیشی عائد بەوە. ئەمە دەلیلە لەسەر هاتنە جێی مانەوە لەسەر سنوور بە مانەوەی یەک ڕۆژیش بێ لەسەر سنوور. وە میقداری جێگای ئەو دارەی کەوولاغی پێ لێ دەخوڕن لەبەهەشت باشترە لەدونیاو لەهەرچی لەسەر دونیاشە: ئەو دانە ڕۆژی هێوارە کە لەنیوەڕۆیە هەتا

ڕۆژئاوا دەڕوا لەڕێگای خودا ئەو دانە ڕۆژی سبەینە هەتا نیوەڕۆ کە بڕوا لەڕێگای خودا باشترە لە دونیاو لەهەرچی لەسەر دونیاش هەیە. (لەفظی) فی سبیل الله دەگوترێ بۆ هەر خواپەرستی‌یەک کە تەنیا مەبەست خودابێ وەکوو بەجێ گەیاندنی فەرزو سونەت بەلام لەبەر ئەوەی زۆرجار لەبابەت (جهاد) بەکار هاتووە بوویتە ڕاستی‌یەکی شەرعی بۆ جهاد.

٧٤١: عَن سَعْد ابن أبي وَقّاصٍ (ض) هَلْ تُنصرونَ وتُرزقونَ اِلاّ بِضُعفائِكُمْ.

**تەرجەمە**

٧٤١: دەگێڕنەوە لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەرێ ئێوە یاریدە دەدرێن لەسەر دوژمن وە دەولەمەندیش دەکرێن بەهەژارەکانتان نەبی یەعنی سەرکەوتنتان لەسەر دوژمن و فرەوانی ڕزقو گوزەرانتان لەلایەن خواپەرستی زەعیفەکانتانە چونکی دلیان بەدونیاوە نەبەستراوە وە دەروونیان صافە.

دوعایان قبوول دەبی. (لێرە استفهام بۆ انکارە) (واتە پرسیار بەووشەی (هل) بەواتا (نا) یە).

ئەم خطابەی پێغەمبەر (د) لەبەر ئەمەبوو چونکی سەعد واتێگەیشت کە فضلیکی هەیە لەسەر ئەصحابەکانی تر لەبەر ئازایی و دەولەمەندی.

٧٤٢: عَن أَبي سعيدٍ(ض) يأتي على الناس زَمانٌ يغزوا فِئامٌ مِنَ النّاس فيقالُ هَلْ فيكُمْ مَن صَحِبَ النبيَّ صلى الله تعالى عليه وسلم. فيُقالُ نَعَمْ فَيُفْتَحُ عَلَيْهِ ثمَّ يأتي زَمانٌ فيُقالُ فيكم مَن صحِبَ اصحابَ النبيِّ صلى الله تعالى عليه وسلم فَيقال نَعم فيُفتَحُ. ثمَّ يأتي زَمانٌ فيُقالُ هَلْ فيكُمْ من صَحِبَ صاحِبَ اصحاب النبي (ص) فيُقال نَعمْ فيُفْتَحُ.

**تەرجەمە**

٧٤٢: دەگێڕنەوە لەئەبو سەعیدی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی دێتە سەر خەلکی زەمانێک جەماعەتێک غەزا دەکەن - یەعنی بە لەشکرێکی ئیسلام دەگۆترێ ئەرێ یەکێکی واتان لەناوە بەئیمانداری پێغەمبەری دیتبێ. دەگوترێ: بەلێ: ئنجا لەپیروزی و بەرەکەتی ئەو ئیسلام سەردەکەوێ و زەفەر دەبا.

لەپاشان زەمانێک دێ دەگوترێ ئەرێ لەناوتان هەیە یەکێکی وا صحبەتی صەحابەیێکی پێغەمبەری کردبێ دەگوترێ (ئا) ئنجا لەبەر پیرۆزی ئەو ئیسلام سەردەکەون کافر ژێردەکەوون، لەپاشانیش زەمانێک دێ دەگوترێ ئەرێ لەناوتان هەیە یەکێکی وا برادەرانی برادەری صەحابەیەکی پێغەمبەری کردبێ دەگوترێ (بەلێ) ئنجا لەبەرەکەتی ئەو ئیسلام سەردەکەوێ و زەفەر دەبا بەدوژمن.

٧٤٣: عَن أَبي أُسَيْدٍ اِذا اكْثَبوكُمْ فَعَلَيْكُمْ بالنَبْلِ.

**تەرجەمە**

٧٤٣: دەگێڕنەوە لەمالکی کوڕی ڕەبیعەی ئەنصاری ساعیدی کە کونیەی ئەبو ئوسەید بوو لەغەزای بەدرو ئوحودو ئەوانی تریش مەوجودبوو وەفاتی لەپاش هەموو ئەصحابی بەدر بوو: گوتی لەغەزای بەدر وەکوو ئێمە ڕێزمان بەست لەبەرامبەری قوڕەیش و ئەوانیش ڕێزیان بەست پێغەمبەر (د) فەرمووی: هەر وەقتێک ئەمەندە لەئێوە بەنزیک کەوت دوژمن کەتیر بیانگاتێ ئەوکاتە تیربرانیان بکەن نەوەک تیرەکانتان بەبێ هوودە و بەخۆڕایی بچی.

(ش): «اكثبوكُم»: اي قاربوكم قرباً نسبياً تنالهم السهام».

٧٤٤: عَن علي (ض) إرمِ فداك أبي.. وَأُمّي.

**تەرجەمە**

٧٤٤: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی علی رەزای خودای لێ بی گوتی نەمزانیوە پێغەمبەر (د) لەغەزای ئوحود بەکەسێک بلێ فیداتبێ باوکو دایکم لەپاش سعدی کوڕی ئەبی وەقاص بەلام لەغەزای ئوحود لەسالی سێیەمی هیجری گوێم لێ بوو پێغەمبەر (د) بەسەعدی دەگوت تیر بۆ کافران باوێ باوکو دایکم بەقوربانت بی. بەلام لەسالی چوارەم یا پێنجەمی هیجری ئەم لەفظەی بۆ زبیریش گوت وەکوو خەبەری بەنی قورەیظەی بۆ هێناوە.

زملکان گوتیتی قسەی حەق و ڕاست ئەم عبارەتەی تفدیە عرفا وەرگیراوە لەمەعنای حەقیقی خۆی بۆ مەعنای لێ ڕازی بوون: هەروەکوو بلێ: تیر باوێ چونکی ئازایی و تیرەندازی باشی زۆر ڕازیم لەتیر هاویشتنت. ئەمەتان تێ دان و هاندانە بۆ کوشتاری کافران.

٧٤٥: عَن ابن عَبّاس (ض) اللهُمَّ أَني أَنْشُدُكَ عَهدكَ ووَعْدَكَ اللهُمَّ اِنْ شِئتَ لَمْ تُعبَد بَعْدَ اليَوْم. فأخذَ ابو بكرٍ بيده فقال حَسْبُكَ يارسول الله فقد الْحَحْتَ على رَبِّكَ وَهوَ في الدِّرع فَخرجَ وهوَ يَقولُ. سيُهزَم الجَمْعُ وَيُوَلّونَ الدُّبُرَ بلِ السّاعَةُ أَدهى وَأَمَرُّ.

**تەرجەمە**

٧٤٥: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەغەزای بەدر لەناو قوبەیەکدابوو لەخانوەکانی عەرەب وەکوو خیوەتبوو لەپێش خودا

پاڕاوه گوتی ئەی خودایه تکات لێ دەکەم پێمان ببەخشی ئەو نەصرەتی کە پەیمانت داوه لەگەڵ پێغەمبەران کە سەرخستنی ئیسلامه. وەپیمان بدەی ئەو بەڵێن و وەعده کە شکاندنی لەشکری شەیتانه ئەی خودایا ئەگەر بتەوێ بەهیلاکچوونی ئیمانداران لەپاش ئیمرۆ کەس نات پەرستی «چونکی زیاد لەمەنده کە ئیمانداره هیچ ئیمانداری تر لەسەر عارد نی‌یه) دەشیزانی ئەگەر خۆی و ئیماندارەکان بەهیلاک بچن چونکی خۆی (خاتم النبین). واته هیچ پێغەمبەر نابن پاشی ئەو ئەمه تەسلیم بوونه بەئەمری خودا لەهەرچی بی‌یەوێ لەچاکەو خراپه لەسەرخستن و بەهیلاکدان وه ڕەدیشه لەسەر (موعتەزیله) که دەڵێن مەبەستی خودا نی‌یه) پاشان حەزرەتی ئەبو بەکر دەستی پیرۆزی پێغەمبەری گرت گوتی ئەمەنده رجایەی تۆ بەسه بۆ تۆ بەڕاستی زۆر پاڕایەوه لەخودا. پێغەمبەر (د) کەلەناو زرێ بوو تەشریفی هاته دەرێ و دەیەم ئایەتەشی دەخوێندەوه. [سَيُهزَمُ الجمع...الخ]. یەعنی لەمەپاش جمع و لەشکر دەشکێ و پشت دەدا تووشی عەزابدەبن لەدونیا بەعەزابێکی کاتی (موەقەت) وەکوو دونیا کە موەقەته. بەڵکی بەعەزابی ئەصلی و ئەبەدیش -عەزابی هەتا هەتایەش- عەزاب دەدرێن ڕۆژی قیامەت- کە ئەو ڕۆژەش که قیامەته ڕۆژی عەزابی ئەصلیتیان. وه عەزابی قیامەت سەخت و گەورەترو تاڵتره.

ئەبو حاتەم لەعەکرەمه ریوایەت دەکا گوتی وەکوو ئایەتی -سیهزم الجمع...الخ. هاته خوارێ حەزرەتی عومەر گوتی ئایا دەبی چه کۆمەڵ و جەمعیەت بشکێ و چی کۆمەڵ و جەمعیەت سەرکەوێ. ئنجا وەکوو لەغەزای بەدر پێغەمبەر (د) ئەم ئایەتەی خوێندەوه حەزرەتی عومەر گوتی ئەوا لێکدانەوەی ئەم ئایەته لەغەزای بەدر هاته جێ.. هەروەکوو لەسەر فەرموودەی ئایەت کافر شکانو کوژران و گیران عەسکەری ئیسلامیش سەرکەوتن.

**٧٤٦: عَن أُمِّ حَرام (ض) اوَّلُ جَيْشٍ مِن أُمَّتي يَغزونَ البَحْرَ قَدْ اوجَبْوا. قالَتْ قُلتُ يارسولَ اللّهِ انا فيهم. قالَ انتِ فيهم. قالت ثمَّ قال النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم. اوَّلُ جَيْشٍ مِنْ امَّتي يَغزونَ مدينةَ قيصرَ مَغْفورٌ لَهُم. فقُلْتُ انا فيهم. قالَ لا.**

**تەرجەمه**

٧٤٦: دەگێڕنەوه لەئومی حەرام کچی مەلحان پلکی ئەنەسی ابن مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی بیستم له پێغەمبەر (د) دەی فەرموو پێشترین هەموو لەشکرێکی ئومەتی من کە غەزا دەکا لەبەحر. بۆ خۆیان لێ بوردن و میهرەبانیان گیرا بەواجب. ئومی حەرام گوتی عەرزم کرد من لەوانم فەرمووی تۆ لەوانی پاشان فەرمووی یەکەم لەشکریکیش

لەئومەتی من کە غەزا دەکەن لەشاری قەیصەر کە ئەستەنبۆلەو قوسطەنطینیە مەغفرەت بەوان کراوە. گوتم ئەی پێغەمبەری خودا من لەوانم فەرمووی نا.

(ش): ئنجا ئوم حەرام لەساڵی بیستوهەشتی هیجری وەکوو معاویە چووە سەر قوبرص. لەگەڵ عوبادەی کوڕی صامتی مێردی سواری مەرکەبی بەحری بوون وەکوو گەڕانەوە لەسواری ووشتر بەربۆوە ملی شکا وەفاتی کرد. یەکەم لەشکری ئیسلامیش کەچووە سەر قسطنطینیە لەشکری یەزیدی کوڕی معاویە بو چەند لەساداتی صەحابانی لەگەڵدابوو. وەکوو ابنی عومەر و ابنی عەباس و ابنی زوبیر وە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری کە ساڵی ٥٢ بەنجاودوویی هیجری لەئەستەنبول وەفاتی کرد.

(شەرح): مەهلەب استدلالی بەم حەدیثە کردووە واتە ئەم حەدیثەی کردوەتە بەڵگە لەسەر ڕاستی خەلافەت بۆ یەزید وە لەئەهلی بەهەشتیشە چونکی لەباسی (مغفور لهم) ئەویش تێدایە. جواب دراوەتەوە لازم ناکا لە دخولی یەزید لەم عمومە دەرنەهێنرێ بە بەلگەیەکی تایبەتی. چونکی بەبێ خلاف لەفظی (مغفور لهم) بەستراوە بەشەرتی ئیمان و لێ وەشانەوەی مەغفیرەت (لێ بوردن) چونکی ئەگەر یەکێک مورتەدبوو لەپاش غەزای شاری قەیصەر موحەقەقە داخلی (مغفور لهم) نەبوو هەروەکوو ابن منیر وای گوتوە.

خۆ موحەقەقیشە هەندێ لە عولەما لەسەر نقل لە سعدالدین عەلامەی تەفتازانی گوتویانە یەزید وەکوو فەرمانی دا بەکوشتنی ئیمامی حوسەین کافربوو لەعنەتیشی لەسەر جائزە. ئنجا لێرە شێخ الاسلام شێخ عبدالله شەرقاوی دەلێ قسەی حەق لەبەر ڕەزای یەزید بەکوشتنی حوسێن وە دلخۆشبوونی بە گەیشتن بەپلەی شەهید بوون. ئێمە ڕاناوەستێن دەرحەق بەیەزید بەلکی بەسەربەستی دەلێین لەعنەت لەخۆیو لەئیمانی و لەئەنصاری و لە ئەعوانی بێ. وە ئەوکەسەش استدلال بە نەهی پێغەمبەر دەکا لە لەعنەت لێ کردنی موسولمانان وە ئەهلی قیبلە لەعنەت لێ کردنی مەمنوعە وە ئەم قسەش دیارە بەلام اسلامەتی و ئیمان و قیبلەی لەکوێ بوو تا بۆ ئەو مەمنوع بێ.

٧٤٧: عَنْ عَبدِاللّهِ ابْنِ أَبي أَوفى (ض) اللهُم منَزِلَ الكِتابِ سَريعَ الحِسابِ اللّهمَّ أهْزِمْ الاحزابَ اللهمَّ: اهزمْهُم وزَلْزِلْهُمْ.

تەرجەمە

٧٤٧: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی ابی أوفی کە عەلقەمەی کوڕی خالدی أسلمی (بوو) گوتی لەغەزای ئەحزاب پێغەمبەر (د) دوعای لەکافران کرد. گوتی ئەی خودایا ئەی

ئەوزاتەی قورئانت ناردووتە خوارێ وە لەویشدا وەعدەی سەرکەوتنت بەئیمەداوە بەفەرموودەی خۆت [وقاتِلوهم يعذبهمُ اللّهُ بأَيديكُمْ ويُخْزِهِم وَينْصُركُمْ عَلَيهِمْ]. ئەی ئەو زاتەی کە لەماوەی نیوڕۆژ بەیەک دەفعە لەگەڵ هەموو عالەمی سەرەتاو دوایی حسابیان دەبڕیەوە ڕۆژی قیامەت. ئەی خودایا بیانشکێنەو بیانخە لەرزین لەکاتی گەیشتن بەیەک لەشەڕدا خۆیان پێ ڕانەگیرێ لەبەرامبەر ئیسلام «ئنجا بەڕاستی چلۆن دوعای فەرموو ئەوهایان بەسەر هات».

## ٧٤٨: عَن عائشة (ض) مالَكِ فَلَمْ تَسمعي ماقُلْتُ وعَلَيْكُمْ.

### تەرجەمە

٧٤٨: دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە ڕەزای خودای لێ بی. جوولەکە هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) لەجیاتی السلام عليكم گوتیان [السام عليك] یەعنی مردنت لەسەربی منیش گوتم لەعنەتتان لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی تۆ چیتە. منیش پێم گوت ئەدی تۆ گوێت لێ نی‌یە ئەمانە چیان گوت. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەدی نەت بیست منیش بەوانم گوت (وعليكم) یەعنی مردن لەسەر ئێوەش بی. چونکی پێغەمبەر (د) لەجوابی ئەوان هەر فەرمووی (وَعَلَيْكُمْ).

## ٧٤٩: عَن أَبي هريرة (ض) اللهُمَّ اهدِ رَوساً وأْتِ بِهِمْ».

### تەرجەمە

٧٤٩: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی طوفەیلی کوڕی عامری ڕەوس لەخەیبەر بە هەشتا سوارەوە هاتە خدمەت پێغەمبەر کە پێشتریش لەمەککە بەخدمەت پێغەمبەر گەیشتبوو موسولمان بوبو پێ یان گوت یارسول الله عەشیرەتی ڕەوس موسولمان نابن بەقسەی طوفەیل ناکەن ئنجا دوعایان لێ بکە لەناوبچن هەندێ لەوانەی لەوێ دانیشتبوون گوتیان (فەوتان) یان لەناوچوون. پێغەمبەر فەرمووی یاخودا هیدایەتی ڕەوس بدەی موسولمان بن بشیان هینی بۆ ئێرە بەموسولمان بوون (قەبیلەی ڕەوس قەبیلەی بەنی هورەیرە بوون).

ئنجا تەماشای ڕەووشتی گەورەی پێغەمبەر بکە لەمیهرەبانی و بەزەیی بەئومەتی خۆی چەند زۆربووە. ئەوان ڕجایان کرد دوعایان لێ بکا ئەو دوعای باش و دوعای هیدایەتی بۆ کردن. لەسەر ڕەووشتی قورئان بووە کە دەلێ [ادفع بالّتي هي احسن]. یەعنی لەبەرامبەر خراپە چاکە بکە لەبەرامبەر چاکەی بچووک چاکەی گەورە بکە.

٧٥٠: عَن سهل (ض) لأُعطيَنَّ الرّايَةَ رَجُلاً يَفتَحُ اللّهُ على يَديْهِ. ايْنَ عَليٌّ فقالَ نقاتِلِهُمْ حتّى يكونوا مثلَنا فقالَ على رِسْلِكَ حتى تَنْزِلَ بساحَتِهِمْ ثمّ أُدعُهُمْ الى الاسلامِ واخْبِرهُمْ بما يَجبُ عَلَيهِمْ فواللّهِ لأن يُهدى بِكَ رَجُلٌ واحدٌ خيرٌ لَكَ مِن حُمْرِ النُّعَمِ.

تەرجەمە

٧٥٠: دەگێڕنەوە لەسەهلی کوڕی سعدی ساعدی گوتی بیستم لەپێغەمبەر (د) ڕۆژی خەیبەر لەساڵی نۆیەمی هیجری فەرمووی ئاڵا دەدەمە پیاوێک خودا لەسەر دەستی ئەو فەتح بکا صەحابەکانی مەوجود لەوێ هەموو هەڵسان. هەرکەس ڕجای ئەمەبوو ئاڵای پێ بدرێ پاشان فەرمووی لەکوێ یە (علی) پێ یان گوت هەردوو چاوی دێشی. ئەمری فەرموو بۆلای منی بێنن وەکو هێنایان تفی پیرۆزی خۆی لەهەردوو چاوی کرد یەکسەر لەجێگای خۆی نەجولا هەردوو چاوی چاک بۆوە بەدەرەجەیەکی وا گۆیا لەحەیاتی خۆی چاوی کول نەبووە گوتی ئەی پێغەمبەری خودا کوشتاریان لەگەڵ دەکەین هەتا موسولمان دەبن وەکوو ئێمە. پێغەمبەر (د) فەرمووی لەڕۆیشتن تالووکە مەکەوە بەعەجەلە مەبە هەتا بەلەشکری خۆتەوە لەدەوروپشتی خانوەکانیان بەنزیکی دادەبەزی. لەپاشان لەپێش دەست پێ کردنی کوشتار. بانگیان بکە بۆ دینی ئیسلام وە خەبەریان پێ بدە بەهەرچی واجبە لەسەریان بە حەقی خودا یەکێک لەوان بەواسطەی تۆ بێتە سەر دینی ئیسلام بۆ تۆ باشترە لەچەند مێگەل ووشتری سوور کە بیکەیە خێرو صەدەقە.

لەم حەدیثە دوو موعجیزەی گەورەی لێ دیارە یەکی یان: زانین بەگرتنی قەلای خەیبەر لەسەر دەستی (عەلی) کەئەوی تایبەت کرد بەئاڵای دووەمیان: چاو چاک بوونەوەی حەزرەتی (علی) بە تفی پیرۆزی جێ بەجێ. ئنجا حەزرەتی (علی) ڕەزای خودای لێ بی لەسەر فەرمانی پێغەمبەر (د) بەعەسکەریەوە چووە سەر خەیبەرو داگیری کرد.

٧٥١: عن أَبي هريرةَ اِن لقيتم فُلاناً وَفُلاناً فحرّقوهما بِالنّار. اِنّي كُنْتُ أَمرتُكُمْ اَن تحرّقوا فلاناً وفلاناً بالنار اِنَّ النّار لايعذّبُ بها اِلاّ اللّهُ فان اخذتموهما فاقتلوهما.

تەرجەمە

٧٥١: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی. گوتی پێغەمبەر (د) ئێمەی لەگەڵ لەشکرێکی نارد لەژێر سەرکردایەتی (حمزەی کوڕی عەمری سەلەمی). فەرمووی ئەگەر تووشی هەبارو خالدی کوری قەیس هاتن لەقورەیش بەئاگرییان بسووتێنن. [چونکی ئەمانەبوون ووشتری زەینەبی کچی پێغەمبەریان ڕاجفلاندبوو ووشترەکەش ڕاپەڕی بوو

زگـیشی لەبەرچووبوو. ئەبو هورەیرە گـوتی وەکـوو ویـسـتـمـان بڕۆین هاتین بۆ خـدمـەت پێـغـەمـبـەر (د) دوعـا خـوازی لێ بکەین فـەرمووی من فـەرمانم بەئێـوە کرد فـلان و فلان بسوتێنن بەئاگر (مەیان سـووتێنن). چونکی عـەزابدان بەئاگر تایبەتە بەخودای گەورە ئنجا ئەگەر ئەوانتـان گرت بیـان کوژن. شێـخی شەرقاوی فـەرمـوویتی لەمەدا نەسخی ئەوە دەکا ئەگەر پێشـتر سووتاندن هەبووبی بۆ مـرۆڤ. بەلام کـاتی ئەم حروفـانە دەلێ نەسخی ئەوە دەکا کەنابی پاش ئەم حەدیثە سووتاندن ببێ بۆ مرۆڤ واتە (نـسـخی بعد العـمل) نەک (نەسخی قبل العمل) چونکی ئەصحابی گەورەی پێغەمبەر چاوی منافقەکانی عەرنـیـان بەشـیـشی سـورکـرایەوە بەئاگـر کـوێرکـردن چونکی چاوی شـوانی پێـغـەمـبـەریان کـوێلی بوو کوشتبووشیان ووشترەکانیشیان بردبوو هەروەکوو لەمەپێش ڕەت بووە.

٧٥٢: عن أبي هريرة (ض) نحن الآخِرون السابقـونَ مَن أطاعني فَـقَـدْ أطاعَ اللّهَ وَمَنْ عَصاني فقد عَصـى اللّهَ وَمَنْ يُطِعِ الأمـيرَ فَقَدْ أطاعَني وَمَن يعْصِ الأمـيرَ فقد عَصاني. وانّما الامامُ جُنَّةٌ يقاتَلُ مِن ورائِهِ ويتقي به فأن أمَرَ بتقوى اللّهِ وعَدَلَ فانَّ له بذلِك أجْراً وانْ قالَ غيرَهُ فانَّ عَلَيْهِ مِنْهُ.

تەرجەمە

٧٥٢: دەگـێـڕنەوە لەئەبوو هورەیرە- ڕەزای خودای لێ بی گـوتی پێـغـەمـبـەر فـەرمووی ئێمە لەدونیـا لەپاش کەوتوانین لەقـیـامـەتیش لەپێش کەوتوانین هرکەسێـک بەئەمری من بکا بەڕاستی بەئەمـری خـودای کـرد (چونکی من فـەرمـاندەر نیم خـودا فـەرمـاندەرە من ڕاگەیێنەرم. وە هەرکەسێـکیش عـاصی بێ لە ئەمیر بەڕاستی لەمن عـاصـیـە وە بەڕاستی ئەو ئیـمـامەی مافی خەڵـک دەپارێزی دوژمن قـەدەغـەدەکا لەعـەزابدانی مـوسـوڵمانان وەکوو مەتاڵە کوشـتـاری لەپێش دەکرێ (ئەگـەرچی لەکـاتی کـوشـتـار کوشـتـاری لەپشت دەکرێ مەتاڵ). وە بەئیـمـامی لەشکر خۆی دەپارێزی. وەکوو مەتاڵ چونکی ئیـمـامی عـادل قـوەی قەلبیەو مەعنویەیان زیاد دەکا. ئنجا ئەگەر ئەمـیریش ئەمری بە تەقوای خوداو عەدالەت کرد بەبێ شک بۆی هەیە بەم ئەمرە کە کردیتی پاداشتێکی گەورە.

٧٥٣: عَن سَلَمَةَ ابن الاكْوَع (ض) يا ابْنَ الاكْوع الا تُبايعُ قُلْتُ قد بايَعْتُ يارَسول اللّهِ. قالَ وأيْضاً فقيلَ لَهُ على أيِّ شيْئٍ كُنْتُمْ تُبايِعونَ يَومَئِذٍ قالَ عَلى المَوْتِ.

تەرجەمە

٧٥٣: دەگـێـڕنەوە لەسەلەمـەی کوڕی ئەکـوەع ڕەزای خودای لێ بی گـوتی لە (بَیْـعَـةُ

الرِّضْــوان)ی حودەیبە لەژێرداری مەعهود بەیعەتم بە پێغەمبەر کرد پاشان چووم لەژێر دارێکی تر ڕاوەستام هەتا ئەهلی موبایەعە سوکبوون. پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی کوڕی ئەکوەع ئەرێ تۆیش موبایەعە ناکەی پێم گوت من موبایەعەم کردووە ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی جارێکی تریش ئنجا دووبارە موبایەعەم کرد (دووبارە کردنەوەی موبایەعە لەبەر ئەمەبوو چونکی کوڕی ئەکوەع پیاوێکی بێ قصور بوو لەگەڵ ئازاییشی ڕووح بەخش بوو لەسەر خۆشەویستی پێغەمبەرو دینی ئیسلام. ئنجا بۆ خاتری ڕەزای کوڕی ئەکوەع تەحقوق بکا لەبەخشینی ڕوحی خۆی لەفیدای دینی ئیسلام دووبارە تەکلیفی موبایەعەی لێ کرد تا باش بزانرێ کە پێی خۆشە). ئنجا بەکوڕی ئەکوەع گۆترا. ئێوە لەبیعە الرضوانی حودەیبیە لەسەرچی موبایەعەتان دەکرد. گوتی لەسەر مردن یەعنی ڕانەکەین ئەگەر بشمرین.

(ش) ئەمە دەلیلە لەسەر ئەمە لە دووبارەی لەفظی نکاح و شتی تریش فەسخ نیە بۆ عەقدی پێشو. بەلکی تەثبیتە (واتە چەسپاندن) بەڵام بەپێچەوانەی ڕای هەندێ شافعیەکان گووتویانە جاری دووەم فەسخی جاری یەکەم دەکا بۆیێ لەباسی تەحریمی تەکبیری تەحەڕوم تەصریح دەکەن بەهەر تاکێک لەتەکبیری تەحەروم داخلی نوێژ دەبی بەهەر جوتێک لەدخولی پێشوو خارج دەبی و مباشرەت بە دخولێکی کە بۆ دووەم جار دەکەی.

**٧٥٤: عَن مُجاشِعٍ (ض) مَضَت الهجرةُ لأَهْلِها فَقُلْتُ على مَ تُبايِعُنا يارسولَ اللّهِ قالَ على الأسلامِ والجِهادِ.**

**تەرجەمە**

٧٥٤: دەگێڕنەوە لەموجاشعی کوڕی مەسعودی سولەمی کە لەکوشتاری جەمەل کوژرا گوتی من و موجالیدی برام هاتینە خدمەت پێغەمبەر (د) پێم گوت موبایەعەمان لەگەڵ بکە لەسەر هیجرەت فەرمووی حوکمی هیجرەت بۆ ئەوانەی کە هیجرەتیان کرد لەپێش گرتنی مەککە. (کە وجوبی جهاد بوو) ڕۆیی ئەم حوکمە لەپاش فەتح نەما. پێم گوت ئەدی لەسەرچی موبایەعەمان لەگەڵ دەکەی. فەرمووی لەسەر ئەوەی کە ئایینی ئیسلامتان وەرگرت بەتەواوی و لەسەر جیهادیش لەکاتی پێویست.

(ش) لەپێش فەتحی مەککە هەرکەسی موسولمان بووبایە جهادی لەسەر فەرز بوو بەئەبەدی دائما بە مەعذەرەتێکی مانعە نەبوایە لەپاش گرتنی مەکە ئەم وجوبە نەما ممکن دەبوو ئەگەر بۆ جهادیش نەچن.

٧٥٥: عَن عبدالله ابْن ابي أَوْفي (ض) ايُها النّاس لاتَتَمَنُّوا لِقاءَ العَدوّ وسَلوا اللّهِ العافِيَةَ فاذا لَقيتموهُم فاصبِروا واعلَموا اَنَّ الجنَّةَ تحَتَ ظِلالِ السيّوف ثُمَّ قالَ اللهُمَّ منزِّلَ الكِتابِ وَمُجْرِيَ السحَّابِ وهازِمَ الاحْزابِ اُهزِمْهُمْ وَانْصُرْنا عَلَيْهِمْ.

### تەرجەمە

٧٥٥: دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی ئەبو ئەوفا ڕەزای خودای لێ بێ. گوتی پێغەمبەر (د) لەجهادێک لەسبەینەوە دەستی بەکوشتاری دوژمن نەکرد چاوەڕێی کرد هەتا نیوەڕۆ پاشان لەناو ئەصحاب هەلستا بەدواندەر (خطیب) فەرمووی ئەی خەلک ئێوە تەمەناو ئارەزووی گەیشتن بە دوژمن مەکەن. (چونکی پیاو ئەنجامی کار نازانی ئایا چەلایەک سەردەکەوون). داوای سەلامەتی خۆتان بکەن لەخودا پاشان وەکوو لەگەڵ دوژمن گەیشتنە یەکتری خۆتان ڕاگرن (چونکی سەرکەوتن لەگەڵ خۆڕاگرتنە). وبشزانن کە بەهەشت لەژێر سێبەری شیران دایە (یەعنی چلۆن سێبەری شیر جودا نابێتەوە بەهەشتیش لەوەشاندنی شیری موجاهیدان جودا نابێتەوە بۆ موجاهیدان). پاشان فەرمووی بەپاڕانەوە لەخودا ئەی خودایا کە قورئانت بۆ ڕێ نیشاندانی ئێمە ناردە خوارێ وە هەوران دەگێڕی بۆ ئەو جێگایەی ئیرادەت لەسەری هەبی وە عەشیرەتەکانی جۆر بەجۆر کە هاتبوونە سەر مە دینە لەشەڕی ئەحزاب هەمووت شکاندن ئەمانەش بشکینی وە سەریشمان بخەی بەسەر ئەمانەشدا.

٧٥٦: عَنْ يَعْلي (ض) ايدفَعُ يَدَهُ اِلَيْكَ فَتَقْضَمَها كما يَقْضَمُ الفَحْلُ.

### تەرجەمە

٧٥٦: دەگێڕنەوە لە (یەعلی کوڕی ئومەیە) ئیزنی خواستەوە لە پێغەمبەر (د) لەغەزایەک گوتی من پیرم پیویستم بەنۆکەرێک (خادمێک) هەیە بەکرێی دەگرم لەغەزادا خدمەتم بکا. ئیزندرا یەکێکی گرت بەدوو بەش لەهەرچی پێ بڕا پاشان بەکرێ گیراوەکە داوای کرێی دیارکراوی لێ کرد بۆی کرد بەسێ دینار. بەکرێ گیراوەکە لەگەڵ یەکێک بەشەڕهات یەکێک دەستی یەکیکی گەزت گەزتراو لەڕاتەکاندنی دەستی خۆی ددانەکی پێشەوەی خاوەن قەپار هاتە دەرێ شکایەتی برد خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی تۆڵەی ددانم دەوێ پێغەمبەر (د) فەرمووی هیچ تۆڵەی ددانت نی‌یە فەرمووی ئەرێ ئەو دەستی خۆی بەتۆ دەدا تۆش وەکوو ووشتری نێر قەپاری لێ دابگری استفهام بۆ انکارە یەعنی نایدا.

(ش) لەمەدا دروستە خەلک بەکرێ بگری لەجیهاد بەلام بۆ بەکرێ گیراو حەقی بەشی هەیە یا نیە خلاف هەیە. لای حەسەنی بەصری و محمد کوڕی سیرین بەشی هەیە لای ئیمامی شافعی ئەگەر بۆ خدمەتی وولاغ و پاراستنی کەل و پەل بەکرێ گیرابی و نەیشچی بۆ مەیدانی کوشتار بەشی بۆ هەیە ئەگەر نا بۆی نی‌یە. چونکی وەکوو چووە کوشتار بەشەخصی خۆی موستەحەقی بەش دەبی وە دەشبیتە قەرینە لەسەر قەصدی قەلبی کە دەرچوونەکەی هەر بۆ جهاد بووە بوکرێ و خدمەت نەبووە.

٧٥٧: عَنْ أَبي هُريرةَ (ض) بُعِثتُ بِجَوامعِ الكَلِمِ وَنُصِرْتُ بِالرُّعب فَبَينا انا نائِمٌ اوتيتُ مفاتيح خَزائِنِ الأرضِ فَوْضِعَت في يَديَ.

## تەرجەمە

٧٥٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی فەرمووی من کراوم بە پێغەمبەری هەموو عالەم بەم تەرزە گوفتارێک لەفظ کەم و مەعنا زۆر (وەکو قورئان وەکو فەرموودەی پێغەمبەریش) چونکی پێغەمبەر (د) قسەیەکی کەمی دەکرد مەعنایەکی زۆری دەگەیاند. وە لەسەر دوژمنانیش زاڵ بووێە بەترس (یەعنی خودا ترسی منی خستووتە ناو دڵی دوژمنانی من ڕێگای مانگێک لە دەوروپشتی خۆم هەروەکوو لەمەپێش ڕەت بووە).
پاشان وەقتێک من لەخەو دابووم بەمن درا کلیلەکانی خزینەکانی عارد لەنیو دەستی من داندران.

(ش) مەبەست لە خەزائن (واتە گەنجینەکان) خەزینەی پاشایەکانی عاردەو مەعدەنەکانی عاردە لەزێڕو زیوو نەوت و زەیتو شتی تریش.

٧٥٨: عَن أَبي موسى (ض) يا ايها الناسُ ارْبِعُوا على انفُسِكُمْ فانكُمْ لاتَدعونَ أَصَمَّ ولا غائباً اِنَّهُ مَعَكُمْ واِنَّهُ سَميعٌ قريبٌ.

## تەرجەمە

٧٥٨: دەگێڕنەوە لەئەبو موسێ یەعنی لەعبداللەی کوڕی قەیسی ئەشعەری ڕەزای خودازی لێ بی گوتی وەکوو لەبستویەک و بەرزایی‌یەک بەسەریکەوتباین بەدەنگی بەرز

دەیانگوت لا اله الا الله الله اکبر پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی خەلکینە ڕەحم بەخۆتان بکەن. بەڕاستی ئێوە هاوار ناکەنە کەسێکی کەڕ کە گوێی لێ نەبێ. وە هاوار ناکەنە کەسێکی بزر لەخۆتان چونکی بەبێ شکو گومان ئەوکەسەی ئێوە هاواری دەکەنێ لەگەڵ ئێوەدایە بەڕاستی گوێی لەهەموو قسەیەکە بەدزی بکرێ یاخۆ بەئاشکرا نزیکیشە لەئێوەو لەغەیری ئێوە بزر نی‌یە. (ئنجا خواپەرستی و زیکر بەهاوارو دەنگی زۆر بەرز باش نی‌یە چونکی فەرمووی ڕەحم بەخۆتان بکەن مەعنا وامەکەن).

**٧٥٩: عَن أَبي موسى (ض) إذا مَرِضَ العَبْدُ او سافَر كُتِبَ لَهُ ماكانَ يَعْمَلُ مُقيماً صحيحاً.**

**تەرجەمە**

٧٥٩: دەگێڕنەوە لە ئەبو موسا ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکو عەبدی مؤمن - واتا بەندەی باوەڕدار- نەساغ کەوت یاخۆ بەسەفەر چوو هەر خواپەرستی‌یەکی لەحالەتی مانەوەی لەجێگای خۆی و ساغی دەیکرد لەسەفەرو ناساغی بۆی دەنووسرێ با نەشی کردبێ بەلام لەسەر نی‌یەتی کردن بێ ئەگەر لەبەر سەفەرو نەساغی نەبوایە.

(ش): ابن بطال حوکمی ئەو حەدیثەی حەمل کردووتە سەر نەوافل چونکی فەرزەکان بەسەفەرو نەساغی سقوط ناکەن و لەسەری لاناچێ. بەلام هەندێ لەعولەماو زانایان ئەم حوکمەیان لەهەندێ فەرزی واش جاری کردووە کە تایبەتە بەحالی صحەت و ساغی وەکوو هەستان لەنوێژ ئەگەرچی فەرزە بۆ ئنسانی ساغ بەلام وەکوو ناساغ کەوت و بەدانیشتن نوێژی کرد پاداشتی یەکێکی ساغ کە بەپێوە نوێژ دەکا پاداشتی ئەوی بۆ دەنووسرێ بەلام لەسەر ئەم نیەتە ئەگەر ساغ بوایە بە پێوەی دەکرد.

**٧٦٠: عن ابن عمر (ض) لو يَعْلَمُ الناسُ مافي الوَحْدة ماأعلَمُ ماسارَ راكِبٌ بلَيْلٍ وَحْدَهُ.**

**تەرجەمە**

٧٦٠: دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەگەر خەڵک بزانن لەسەفەری بەتەنیا ئەو زیان و زەرەری کە من دەزانم نەدەڕۆیشت سوارێک بەشەو بەتەنیا.

(ش) لەم حەدیثە وەردەگیری سەفەرکردن مەکرووهەو پەسند نی‌یە بەتەنیا مەگەر لەبەر زۆر پێویستی نەبێ. یاخۆ دونیا ئەمین بێ. لەوانەیە سەفەرکردن قەدەغەبێ بەتەنیا لەبەر ترس.

٧٦١: عن عبدالله ابن عمر (ض) أَحَيٌّ ووالِداكَ فقيهما فجاهِدْ.

## تەرجەمە

٧٦١: دەگێڕنەوە لە عبدالله کوڕی عومەر ڕەزای خودای لێ بی گوتی جاحیمەی کوڕی عەباسی کوڕی مەرداس هاتە خدمەت پێغەمبەر(د) داوای ئیزنی لێکرد بۆ جهاد فەرمووی باوکو دایکت زیندوون گوتی بەڵێ: فەرمووی ئەوان تایبەت بکە بەجهاد: (یەعنی خدمەتی ئەوان بۆ تۆ جهادە).

واتە ئەگەر ئەوان لەتۆ رازی بن وەلەژێر فەرمانی ئەوانبی پاداشتی جهادت بۆ دەنووسرێ.

(ش) بەگوێ کردنی دایکو باوک گەورەترە لە جهاد چونکی بەگوێ کردنی ئەوان فەرزی عەینە جهاد فەرزی کفایەیە بۆیێ لای جمهور جهاد حەرامە ئەگەر هەردوویان یاخو یەکیکیان مەنع بکا بەلام بەوشەرتە موسوڵمان بن بەلام ئەگەر جهاد بوو بەفرزی عەین ئیزنیان پێویست نی‌یە لای قسەی زۆری شافعیەکان داپیرو باپیر لەم حوکمە لەگەڵ باوکو دایک وەکو یەکن.

٧٦٢: عن ابي بشير الانصاري (ض) لاتبْقَيَنَّ في رَقَبةٍ بَعيرٍ قِلادَةٌ مِن وَترٍ او قِلادَةٌ إلاّ قُطِعَت.

## تەرجەمە

٧٦٢: دەگێڕنەوە لەقەیسی ئەکبەری کوڕی حورەیری ئەبو بەشیر رەزای خودای لێ بێ لەخدمەت پێغەمبەر دابوو لەهەندێ سەفەرکانی ئەصحابی بەڕێزی پێغەمبەریش شەوێک هەرکەس لەسەر جێگای خۆیان بوون پێغەمبەر(د) زەیدی کوڕی حارثەی هەنارده لای ئەصحاب فەرمووی پێیان بلێ نەمینێ لەملی هیچ ووشترێک خەناوکە بەداوی خۆیەوە یاخۆ فەرمووی خەناوکە نەمینێ مەگەر دەبێ هەمووی لێبکرێتەوە وەدەبی بپسێ.

(ش) حیکمەتی ئەم فرمانەی ترس لەخنکانی ووشتر بوو لەبەر توندی هاتوچۆنی لەکوشتارو جوولانەوەی لەشکر: یا عادەتیان وابوو زەنگوڵەیان لەمل دەکردن لەحەدیثی

(ئومی حەبیبەش) ئاشکرایە مەلائیکە نزیکی ئەو قافلەیە نابن دەنگی زەنگوڵەی لێ بێ.

ئەنجا پێوەکردنی زەنگوڵە بەملی ئاژەڵ مەکروهەو پەسند نی‌یە. یاخۆ عادەتیان وابوو تاری‌کەوانیان لەملی دەکردن لەبەر چاوی پیس. ئنجا فەرمانیدا ئەم تارانە ببڕن چونکی هیچ شتێک قەزاو قەدەری خودا ناگێڕتەوە. ئیمامی مالک لەسەر ئەم قسەی دوایی‌یە.

(لە وولاتی عیراق بەتایبەتی لەلیوای هەولێر عادەتە لەپکەی شین بەهەرشتێکەوە دەکەن کەلەپێش چاویان شیرن بێ بۆ پاراستن لە چاوی پیس ئەمەش مەکروهەو پەسند نی‌یە).

**٧٦٣: عَن ابنِ عباس (ض) لا يَخلُوَنَّ رَجُلٌ بامرَأةٍ ولاتُسافِرَنَّ امرَأةٌ إلاّ وَمَعَها مَحرَمٌ فقامَ رَجُلٌ فقالَ يارسول الله اكسِبْتُ في غَزْوَةِ كذا وكذا وخَرجت امرَاتي حاجَةٌ فقالَ اذهَبْ فَحُجْ مَعَ اِمْرَاتِكَ.**

**تەرجەمە**

٧٦٣: دەگێرنەوە لە عەبدالله‌ی کوڕی عەباس رەزای خودای لێ بێ گوێی لێبوو پێغەمبەر(د)- دەی فەرمو با پیاوێکی نامەحرەم لەگەڵ ژنێک لە جێگای تەنیا نەبێ و ژنیش بەسەفەر نەچێ مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵ دابێ. پیاوێکیش هەلستا پێ‌ی گوت ئەی پێغەمبەری خودا من ناوم لەدەفتەر نووسراوە لەوانەی دەچنە غەزا لەغەزایەکی وەهاوها ژنەکەشم چووە دەرێ بۆ حەج پێغەمبەر(د) فەرمووی بچۆ لەگەڵ ژنەکەت حەج بکە. مەزهەبی حەنەفی ئەگەر ژن بۆ حەج بچێ لازمە یاخۆ مێردی یا مەحرەمێکی لەگەڵ دابێ. بەلام لای شافعی ئەگەر ژنێکی بەشەرەفو جێگای باوەڕ پێ‌کردنیشی لەگەڵ بێ دروستە.

**٧٦٤: عَن ابي هريرةَ (ض) عَجِبَ اللّهُ مِن قَوْمٍ يَدْخلونَ الجَنَّةَ في السَّلاسِلِ**

**تەرجەمە**

٧٦٤: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە رەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر(د) فەرمووی خودای گەورە زۆر رازیە لەو قەومەی دەچنە بەهەشت کەلەدوینا لەناو زنجیران دەبن.

(ش)- کرمانی گوتی‌یەتی لەمەعنای ئەم حەدیثە برماویش تابعی بووە ئەم قەومە ئەوکەسانن ئەسیری کافرانن پاشان لەئەسارەت وەفات دەکەن یاخۆ شەهید دەکرێن لەسەر ئەم حالەتە وەلەسەر ئەم حالەتەش حەشریان دەکرێ و داخلی بەهەشت دەکرێن گۆیا زنجیرەکان بۆیان دەبێتە حوجەتێک وەکوو خوێن بۆ شەهید.

٧٦٥:عَن الصَّعْبِ ابنِ جثَامَةَ (ض) هُمْ مِنْهمُ اوسَمِعْتُهُ يقولُ لاحِمى اِلاّ لِلّه ولِرسولِهِ.

## تەرجەمە

٧٦٥: دەگێڕنەوە لەصەعبی کوڕی جەثامە ڕەزای خودای لێ بێ گوتی پێغەمبەر(د) بەلای مندا ڕەت بوو لەغەزای ئەبواء یا لە غەزای وەڕان پێیان گوت بەپرسیار وادەبێ ئێمە بەشەو بەسەر قەومێکی کافر دادەدەین لەتاریکی شەو فەرقی ژن و منداڵ و پیاو ناکرێ ئایا ئەگەر ژن و منداڵمان لەدەست بکوژرێ گوناهکار دەبین؟.

فەرمووی ژن و منداڵیش لەوانن).

(ش): یەعنی ئەگەر بێ کوشتنی ئەوان نەگەنە پیاوەکانیان دروستە کوشتنیان. ئەگەر نا بەهیچ جۆرەک دروست نیىیە کوشتنی ژن و منداڵی کافران وەکوشتنی ڕاهبان و دەست درێژکردن بۆ ناموسیان. وەبیستیشم دەی فەرموو هیچ پاوان نیىیە بۆ خودا و پێغەمبەری خودا نەبێ- یەعنی هیچ شتێک نیىیە حەقی پاراستن و ڕێزگرتنی هەبێ ئەوشتە نەبێ کەخوداو پێغەمبەری خودا پاراستن و ڕێزگرتنێکیان بۆ دانابێ ئنجا هەرچی پێغەمبەری خودا بەنێوەی گوت ئەمە پاراستراوە لەوەی دەستی بۆ ببردرێ. مەیکەن هەروەکوو ئایەتیش وادەفەرموێ. (وما نهاكمْ عَنْهُ فانتهوا). هەروا لە حەدیثیش هاتووە «عَن ابن عباس(ض) لاتعذبوا بعذاب الله مَن بدّلَ دينَه منا فاقتلُوهُ».

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عەباس ڕەزای خودایان لێ بێ گوتی قەومی سەبەءیەکان کە عبداللەی کوڕی سەبەء سەرۆکیان بوو وایان دەزانی کەحەزرەتی عەلی- کرم الله وجهه- خودای ئەوانە خودای گەورە پاکە لەقسەی قۆڕی ئەوانە ئنجا لەپاش ترساندنیش وازیان لەم اعتقادە هەر نەهینا. حەزرەتی عەلی قەومەکەی بەئاگر سووتاندن پاشان وەکوو ئەم خەبەرە گەیشتە عبداللەی کوڕی عەباس فەرمووی ئەگەر من بومایە ئەم دەسووتاندن چونکی پێغەمبەر(د) فەرمووی- هیچ کەس عەزاب مەدەن بەعەزابی خودا) کە عەزابی ئاگرە چونکی ئەم عەزابە سەختەی بۆ کافران داناوە، هەر لەگەورەیی ئەو دەوەشێتەوە لەقیامەت کافران پێ عەزابدا (وە ئەگەر کەسێک دینی اسلامی گۆڕییەوە بەدینێکیتر بیکوژن) وەکوو ئەم قسەی عبدالله گەیشتە حەزرەتی علی گوتی صدق ابن عباس. مەهلەب گوتیتی ئەم نەهیە بۆ تەحریم نیىیە عەلی و خالد گوتوویانە دروستە عومەرو کوڕی عەباس گوتوویانە- سووتاندن مەکروهەو پەسند نیىیە.

**٧٦٦: عَن ابي هريرة (ض) قَرصَت نملَةٌ نبياً مِن الانبياء فأمَرَ بقريَةِ النَّملِ فَأحْرِقَت فاوحى اللّه اِلَيْهِ اَنْ قَرصَتْكَ نَملَةٌ اَحرَقْتَ اُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبّحُ اللّهَ.**

## تەرجەمە

٧٦٦: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە رەزای خودای لێ بێ گوتی بیستم لە پێغەمبەر(د) دەی فەرموو مێروولەیەک بە عوزێر پێغەمبەری وەدا ئەمری کرد شارە مێروستانەکەیان سووتاند. خودا وەحی بۆنارد لەسەر شێوەی گلەیی یەک مێروولە تۆی گەزت ئاگرت لەئومەتێک لە ئومەتەکانی من بەردا کە تەسبیحاتی منیان دەکرد.

(ش) سەبەبی ئەم قسەیە حەزرەتی عوزێر بەلای قودسدا رەتبوو دیتی خودا وولاتەکەی خراپ کردووە بەسەبەب گوناهی ئەهلەکەی ماوەیەک بەسەرسوڕماوی راوەستا پاشان گوتی ئەی خودایا ئەم شارە چەند منداڵی بێگوناحی تیابوو چەند گیانداری بێگوناحی تیابوو نازانم لەبەرچی بوو بەگوناحی هەندێکان هەمووشت فەوتاند چووە بن دارێک راوەستا مەسئەلەی مێروستانی بەسەرهات خودای گەورەش لەبەرامبەر ئەم خەیاڵەی ئەم وەحیەی بۆنارد. بۆ ئاگادارکردن کە بزانی ئەوی زیان بەخەڵک بگەیەنێ خۆیو منداڵی دەکوژرێ وەبیشزانی ئەگەر موستەحەق و ناموستەحەق تێکەڵ یەکتری بوون زەفەریشت بەموستەحەق نەدەبرد بەکوشتنی ناموستەحەق نەبێ هەموویان دەکوژرێن هەروەکوو لەحەدیثی صەعبی کوڕی جەثامە رەدبوو لەلاپەڕەی بەرامبەر.

**٧٦٧: عَن ابي هريرة (ض) هَلَكَ كسرى ثمَّ لايكون كِسرى بعده وقيصرُ ليهلكنُ ثمَّ لايكونُ قيصرُ بعده ولَتُقْسَمَنَّ كنوزهما في سبيل الله.**

## تەرجەمە

٧٦٧: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە رەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر(د) فەرمووی پاشای فارس مرد کەهەموو پاشایانی فارس لەقەبیان (کسری)یە لەپاش کیسراش کسرایێکیتر نابێ قەیصەری پاشای رۆمیش دەمرێ پاشان لەپاش ئەم قەیصەرەش قەیصەرێکیتر نابێ گەنجینەو سامانی هەردووشیان لەرێگای خودادا بەشدەکرێ. ئەگەر بگوترێ خەبەردانی ئەم حەدیثە لەپاش قورئانی مەجید لەگەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەرە بەدووری مەزانە چونکی فەخری عالەم(د) ئەم قسەیەی لە غەزای ئەحزاب فەرمووە کەهیچ جێگایەکی بەدەستەوە نەبوو شاری مەدینە نەبێ. لەو کاتەش هەموو عارد بەتەواوی لەدەست ئەم دوو

امبراطوریە بوو. سنوریش شام و عیراق بوو لەشامەوە تا مەغرب حکومەتی قەیصەر بوو لەعراقیشەوە بۆ لای رۆژهەلات حکومەتی کسری بوو ئنجا چە عەقلێک تەصور دەکا بەکۆمەلەیێکی پێکەوەنراو لەعەشیرەتەکانی جۆر بەجۆر ئەم دوو امبراطوریە گەورەیە بخرێتە ژێر دەست بەتایبەتی ئەم موژدەیەشی لەکاتی خەندەک هەلکەندن بوو لەترسی دوژمنان لەئەحزابی عەرەبستان و قورەیشی مەککە کەبەچەند هەزار شەرکەرو پالەوان دەورەیان لێدابوون.

٧٦٨: عَن ابي هريرَةَ (ض) الحربُ خِدعَةٌ.

### تەرجەمە

٧٦٨: دەگێرنەوە لەئەبو هورەیرە رەزای خودای لێ بێ شەرکردن فێلە. بەهەر جۆرێک دوژمن فەریب بدەی شتێکی باش و پەسندە ناگوترێ حیلەیکرد بەلکی پێی دەگوترێ شەری کرد چونکی پێغەمبەر(د) ناوی لەشەر ناوە (خدعە) واتە هەلخەلەتاندن هەروەکو لەهەموو شەرحەکانی بوخاری نووسراوە [سَمّی النبيُّ الحربَ خِدعَةً]یم پێغەمبەر(د) لەغەزای خەندەک ئەم حەدیثەی فەرمووە وەکوو تەحیمی کوری مەسعودی نارد بەفێل ناکۆکی بخاتە بەینی قورەیشی و عەطفان و جوولەکە. (بەلام بەهەلوەشاندنەوەی عەهدو ئەمان فێل دروست نییە).

٧٦٩: عَن البَراءِ ابن عازِب(ض) اِن رأيتُمونا تخْطَفنا الطَّيرُ فلا تَبْرَحوا مَكانُكمْ هذا حتّى ارسِلَ اِليكمُ واِنْ رَأيتُمونا هَزَمْنا القومَ وأَوْطَئْناهُمْ فلاتَبْرَحوا حتّى أُرسِلُ اِليْكمْ ثُمَّ اَخَذَ أَبوسُفيان يَرْتَجِزُ أُعْلُ هُبَلْ اعْلُ هُبَلْ فقال النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم اَلا تجيبوا لَهُ قولوا اللّهُ اعلى واَجَلّ قال اِنَّ لَنا العُزّى ولاعُزّى لَكُمْ فقال اَلا تجيبونَ لَهُ قولوا اللّهُ مولانا ولامولى لَكُمْ.

### تەرجەمە

٧٦٩: دەگێرنەوە لەبەرائی کوری عازب رەزای خودای لێ بێ پێغەمەر(د) عبداللەی کوری جوبەیری دانابوو بەسەرۆک لەسەر پەنجا پیادە لەغەزای ئوحود ئەمری پێ فەرموون ئەگەر ئێوە دیتتان ئێمە شکاین و هەموو کوژراین تەیر گۆشتی کەلاکی ئێمەی دەرفاند ئێوە لەجێگای خۆتان نەجوولێن تا من نەنێرمە شوێنتان وەئەگەر ئێوەش ئێمەتان دیت

ئەوانمان شکاندو هەموومان کوشتن بەغایەتێک پێمان لەکەلاکی ئەوان دەنا بەسەر کەلاکی ئەواندا ڕەت دەبووین ئێوە لەجێگای خۆتان مەجوولێن تا من ئەنێرمە شوێنتان (هەردوو لەشکر وەکوو گەیشتنە یەکتری لەشکری کافران شکا شکانێکی خراپ بەراء گوتی والله خۆم دیتم ئەو ژنانەی کە قورەیش لەگەڵ خۆیان هێنابوویان بۆ هاندانی پیاوەکانیان لەترسی ئەصحاب وها ڕایان دەکرد بەسەر کێو بکەوون هەرچەند خلخال و قاچ ساقیان هەبوو لەبەر خۆ هەلکردن وەخۆ گورج کردنیان هەمووی بە ئاشکرا دیاربوو ئینجا پیاوەکانی ژێر سەرکردایەتی عبداللەی ابن جوبەیر وەکوو چاویان بەم شکستە خراپەی کافران کەوت. گوتیان غەنیمەتە بائێمەش لەم تالانە بێبەش نەبین. عبدالله پێی گوتن ئێوە لەبیرتان چوو ئەدی پێغەمبەر(د) بەئێوەی نەگوت بەهیچ حالێک ئێوە لەجێی خوتان مەجوولێن تا من دەنێرمە شوێنتان هەرچەند هاواری کردو ئامۆژگاری کردن گوێیان نەدایێ بەتەقدیری خودا ئەوان لەجێگای خۆیان هەڵ قەنان دیتیان لەشکری ئەصحاب شکستیدا جێگای خۆشیان لەدەست چوو ئەوانیش وەکو ئەو ئەصحابانەی ڕایان دەکرد بەڕاکردن ڕوویان لەمەدینەکرد دوازدەکەس نەبێ هیچ کەس نەما لەخزمەت پێغەمبەر(د) کە ئەمانەن:

١- ابو بکر ٢- عمر ٣- علی ٤- عبدالرحمن ابن عوف ٥- سعدی کوڕی ابی وەقاص ٦- طەلحەی کوڕی عبیدالله ٧- زوبەیری کوڕی عەوام ٨- ئەبو عوبەیدەی جەراح ٩- جنانی کوڕی موتدر ١٠- سعد ابن معاذ ١١- ئوسەیدی کوڕی خضر.

پێغەمبەریش بانگی شکاوەکانی دەکرد ئاگادارین ئەی بەدەکانی خودا من پێغەمبەری خودام هەرکەسی بگەڕێتەوە لەهەلاتن بۆ سەر کافران بەهەشت بۆ ئەوە. لەعەسکەری اسلام هەفتا کەس شەهید کراو بریندارکرا کەسالی پێشووش ئەصحابی بەڕێزی پێغەمبەر لەغەزای بەدر لە کافرانی قورەیش چل کەسیان بریندار کرد هەفتایان لێکوشتن سەدو هەفتایان ئەسیرکردن پاشان (ئەبوسفیان صەخری کوڕی حرب) گوتی ئەرێ محمد لەناو لەشکری اسلام ماوە سێ جار ئەمری بەئەصحاب کرد فەرمووی جوابی مەدەنەوە پاشان سێ جاریش بانگی کرد ئەرێ کوڕی ئەبو قوحافە ماوە سێ جاریش گازی کرد ئەرێ عومەری کوڕی خەطاب ماوە پاشان گەڕاوە ناو لەشکری قورەیش. گوتی ئەمانەی گوتم هەموویان کوژراوون. حەزرەتی عومەر خۆی ڕانەگرت لێی بەجواب هات گوتی والله درۆت کرد ئەی دوژمنی خودا ئەوانەی کە تۆ دەڵێی هەموویان لەحەیات دانە بۆ تۆ ماون ئەوانەی کەتۆ پێت ناخۆشە ئەبوسفیان گوتی کوشتار بەنۆبەتە ئیمرۆتان بەرامبەر ڕۆژی بەدرە وەکوژراوەکانیشتان هەموو بەلووت و دەم بڕاوی دەبینن دەستی بە شیعر خوێندنەوە کرد

(**أُعْلُ هُبَلْ اعْلُ هُبَلْ**). پێغەمبەر(د) فەرمووی بۆ وەڵامی نادەنەوە گوتیان بڵێین چی فەرمووی بڵێن (**اللّٰهُ اعلى واَجلّ**) پاشان ئەبوسفیان گوتی [**إنّ لَنا العُزّى ولاعُزّى لَكُمْ**] پێغەمبەر(د) فەرمووی بۆچی جوابی نادەنەوە پێیان گوت چی بڵێین فەرمووی بڵێن [**اللّٰهُ مولانا ولامولى لَكُمْ**] (واتا خوا خاوەن و گەورەی ئێمەیە ئێوەش هیچ خاوەن و گەورەتان نی یە).

**٧٧٠: عَن سَلَمةَ ابن الاكوَع (ض) يا ابنَ الاكوع مَلَكْتَ فأَسجِحْ إنَّ القومَ يُقْرَوْنَ في قومِهِم.**

## تەرجەمە

٧٧٠: دەگێڕنەوە لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع ڕەزای خودای لێ بێ گوتی لە مەدینە دەرچووم بۆ لای چەم لەنزیک چەم بەندەیەکی عەبدالرحمن کوڕی عەوفم تووشبوو نەختێ مشوەشم دیت گوتم چیت لێ قەوماوە گوتی ووشترەکانی بەشیری پێغەمبەریان برد گوتم کێ بردی گوتی قەبیلەی غەطفان و فیزارە.

منیش بەدەنگێکی بەرز سێ جار گوتم یاصباحاه یەعنی لەهاوارم وەرن لەم سبەینەیە پاشان بەپیادەیی کەوتمە شوێنیان بەئازایی و بەپیادەیی تووشیان هاتم دامگرتن بەتیران ووشترەکانم لەچەنگ نەجات دان لەپێش ئەمە کەئاو بخۆنەوە. منیش ووشترەکانم لەپێش خۆم دەئاژۆت دەمهێنانەوە دیتم پێغەمبەر(د) تووشم هات چونکە وەکوو خەبەر گەیشتە مەدینە پێغەمبەر بەیداغێکی بەست دایە میقدادی کوڕی عەمر بەپێنج سەد سوارەوە فەرمووی ئێوە بڕۆن هەتا لەشکری گەورەی سوارەتان دەگاتێ منیش لەدوای ئێوە دێم منیش پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا دوژمنەکان تێنوو بوون بەڵام من لەپێش ئاو خواردنیان ووشترەکانم لەدەست نەجات دان ئێستا موحەقەق لەسەر ئاوون ئنجا بنێرە شوێنیان پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەی کوڕی ئەکوەع تۆ ئەوانت کردە بەندەی خۆت کە ووشترەکانت لێ ئەستاندنەوە وەدوژمنەکانیش بگەنەوە ناو قەومی خۆیان ووشتریان بۆ دەکوژنەوە زیافەتیان بۆ دەکەن کۆبوونەوەو گردەواریان هەیە یاریدە یاندەدەن ئەنجا مەرحەمەتیان پێبکە عەفوویان بکە:

(**فاسجح**): همزة قطع وسين ساكنة مكسورة الميم وَحاء اي [**فارْفِقْ واَحسِنِ العَفوَ**].

٧٧١: عَن ابي موسى (ض) فكوّا العاني يعني الاسيرَ وأطعِموا الجائعَ وعُودوا المريضَ.

**تەرجەمە**

٧٧١: دەگێڕنەوە لەئەبو موسى ڕەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەسیری موسولمان لەچەنگ دوژمن نجات بدەن بەماڵی بیت المال یەعنی خەزینەی حکومەت و خواردن بدەنە برسی لەمرۆڤ و گیانداران وە بچۆنە لای ناساغ یەعنی زیارەتی بکەن.

(ش) بەرەڵلاکردنی ئەسیرو خواردن دانە برسی فەرزی کفایەنە بەڵام چوونە لای نەخۆش سونەتێکی مۆکەدەیە. لای هەموو زانایان.

٧٧٢: عَن انَسٍ (ض) لاتدعونَ منها دِرْهَماً.

**تەرجەمە**

٧٧٢: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خوادی لێ بێ گوتی چەند پیاوێک لەئەنصار ئیزنیان خواستەوە لە پێغەمبەر(د) گوتیان ئێمە بەدەلی رزگاربوونی خوارزای خۆمان عەباسی مامت دەدەین لە ئەسیر کردنی تۆ. پێغەمبەر(د) فەرمووی نابێ یەک درهەم لە بەدەلەکەی کەم بکەنەوە یەعنی هەمووتان لێ دەستێنم [ئەم قسەی بۆیێ فەرموو نەوەک خەیال بکرێ لەدین خۆشەویستی ڕاچاو دەکرێ). پاشان عەباس خوارزای ئەوان نەبوو بەلکی عبدالمطلب باوکی خوارزای ئەو بوو چونکی لە سەلەمی کچی عەمری بەنی نەجاری مەدینەیی بوو. بەڵام بۆیی وایان گوت تا بۆ عەباس ببیتە منەتێک لەسەر ئەوان نەوەک عەباس مەمنوون بی. لە ریوایەتی ابن اسحاق پێغەمبەر(د) بەعەباسی مامی گوت ئەی عەباس بەدەلی خۆت و دوو برازای خۆت عوقەیلی کوڕی ابی طالب وە نەوفەلی کوڕی حارث و بەدەلی هاوڕێی خۆشت هاوپەیمانت عوتبەی کوڕی عەمر بدە کە هەمووی دەکا چل وەقیە زێڕ. عباسیش ئەهلی ثەروەت بوو بەدەلەکەی لێ وەرگیرا بۆ موجاهیدەکان سەرف کرا. لێرە وا دەزاندرێ کە بەدەلی هەر چواریان لەحەزرەتی عەباس خۆی وەرگیراوە لەوانەیە قبوولی نەکردبێ خەلکی مەدینە لەجیاتی بدەن.

٧٧٣: عَن سَلَمةَ (ض) أُطْلبوهُ وَاقتُلوهُ.

**تەرجەمە**

٧٧٣: دەگێڕنەوە لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع ڕەزای خودای لێ بێ گوتی جاسوسێک لەلایەن کافرەکان هات بۆ لای پێغەمبەر(د) لەسەفەرێک لای ئەصحاب دانیشت قسەی

دەکرد لەپاشان هەڵستا ڕۆیشت. پێغەمبەر(د) فەرمووی بچۆنە شوێنی بیکوژن سەلەمە کەوتە شوێنی کوشتی.

(ش): زیاد لە استحقاقی خۆی لە تالآن چاک و وولاغ و شتومەکی کوژراوەکەی دا سەلەمە لەحەدیث ثابتەو دیارە جاسوسی کافرانی شەڕکەر دەکوژرێ لەسەر ڕای هەموولایەک. بەلآم جاسوسی موجاهید وەزیی (ذمی) لای ئیمامی مالک پەیمان و موعاهەدە هەڵ دەوەشێتەوە بەمە. لای شافعیەکانیش لەهەلوەشاندنەوەی پەیمان خلاف هەیە. بەلآم ئەگەر لەکاتی پەیمان شەرت بکرێ جاسوسی نەبێ بەڕای هەمولایەک پەیمان هەڵدەوەشێتەوە.

٧٧٤: عن ابن عباس(ض) ائتوني بكتابٍ أكتُبُ لكم كِتاباً لَنْ تَضلّوا بَعْدَهُ ابَداً فَتنازَعوا ولايَنْبَغي عِندَ نبي تَنازُعٌ فَقالوا هجَرَ رسولُ اللّه صلى الله تعالى عليه وسلم قالَ دَعوني فالّذي أَنا فيهِ خَيرٌ مِمّا تدعوني اِلَيْهِ. وَأَوْصى عِنْدَ مَوتِهِ بِثلاثٍ. أَخرجوا المشرِكينَ مِن جزيرة العربِ وأَجيزوا الوَفْدَ بِنَحْوِ ماكُنْتُ أُجيزُهُمْ وَنَسيتُ الثّالِثَةَ.

**تەرجەمە**

٧٧٤: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی عباس ڕەزای خودایان لێ بێ گوتی ئای ڕۆژی پێنج شەممە چی ڕۆژێکی سەخت و ناخۆش بوو ڕۆژی پێنج شەم پاشان گریا هەتا بەفرمێسکی چاوەکانی عاردی تەڕکرد پاشان گوتی پێغەمبەر(د) ڕۆژی پێنج شەم لەناساغی وەفاتی زۆر بێ صبحەت بوو فەرمووی قەلەم و دەوات و کاغەزم بۆ بێنن فەرمان دەدەم کاغەزێکتان بۆ بنووسرێ مادام پەیڕەوی بکەن قەت ڕێگای ڕاست بزرنەکەن هەتا هەتایە پاشان حەزرەتی عومەر گوتی پێغەمبەر(د) زۆر نەساغە کتابی خوداش کە قورئانە لای ئێمە هەیە با ئەزیەتی نەدەین بەم تەکلیفە. ناکۆکی پەیدابوو دیاریشە لایق نی‌یە ناکۆکی لای هیچ پێغەمبەرێک. ئەصحابەکانی پێغەمبەر گوتیان پێغەمبەری خودا نەخۆشیەکەی گەلەک سەختە. پاشان فەرمووی واز لە من بێنن لەو حالی کە من تیام کە مراقبەو بیرکردنەوەی عەلاقاتی خودای گەورەیە باشترە لەو شتی ئێوە لێم داوادەکەن کە کاغەز نووسین و شتی‌ترە. لەکاتی وەفاتی سێ قسەی بەوەسیەت بەجێ‌هێشت یەکەم: هەرچی کافرە لە جزیرەی عەرەب دەری‌کەن لە بوت پەرستان. دووەم: هەر قاصدێک و وەفدێک لە وولآتان بێتە لاتان ڕێزیان بگرن ئیجازەو ماوەیان بدەن قسەی سێ‌یەمیش: لەبیری چوو.

قسەی سێیەم لەسەر هەندێ ریوایەت تێک نەدانی لەشکری ئوسامەبوو: یاخۆ قەبری من مەگێڕن بەبوتو سەنەم یاخۆ مەبەستی ئەوەبووە ئاگاداربن لە صلەی رەحم و خزمایەتی. جزیرەی عەرەبیش بەپانایی لەجدە هەتا دەورو پشت شامە. بەدرێژاییش مابەینی عەدەن هەتا کشتوکالی عیراقە. بۆیێ جزیرەیە چونکی لەبەینی دەریای حەبەشەو دەریای فارسی و دیجلەی عیراقدایە یەعنی ئەم میقدار عاردە خالص عاردی عەرەبەو کانگای عەرەبە بۆیێ پێی دەڵێن (جزيرة العرب).

٧٧٥: عن ابن عمر(ض) اَتشهَدُ اَنّي رسولُ اللّهِ اٰمَنْتُ باللّهِ ورَسُلِهِ ماذا ترى خُلِّطَ عَلَيْكَ الامرُ إنّي خَبَئْتُ لَكَ خبيئاً قالَ ابنُ مَيادٍ هوَ الدُّخُ قال النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم إخسَأْ فلَن تَعدوَ قَدْرَكَ قالَ عُمرُ يارسولَ اللّهِ ائْذَنْ اَضْرِبْ عُنُقَهُ قالَ اِنْ يَكُنْهُ فلَنْ تُسلِّطَ عَلَيْهِ وان لم يكُنْهُ فلا خَيرَ لَكَ في قَتْلِهِ لَو تَركْتَهُ بَيَنَ.

**تەرجەمە**

٧٧٥ ئەم حەدیثەی دەجال جلدی پێشوو مەعناو شەرحەکەی لێدراوەتەوە بۆیێ لێرە دووبارەمان نەکردەوە.

٧٧٦: عَن ابن عمر رضي الله تعالى عَنْهما. قامَ النَّبيُّ صلى اللّه تعالى عَلَيْهِ وسلَّم في الناس فَأثْنى على اللّهِ بما هُوَ اهْلُهُ ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجّالَ فقالَ راني أُنذِركموهُ وَمامِنْ نَبيٍّ اِلاّ قَدْ اَنْذَرَ قَوْمَهُ لَقَدْ أَنذرَهُ نوحٌ قَومَهُ وَلِكنْ ساقولُ لَكُمْ فيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نبيٌّ لِقَوْمِهِ تَعْلَمونَ اَنَّهُ اعورُ وَانَّ اللّهَ لَيْسَ بأَعْوَرَ.

**تەرجەمە**

٧٧٦: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر رەزای خودای لێ بێ گوتی پێغەمبەر(د) هەڵستا لەنێو ئەصحاب لەخوتبەدا سوپاسی ستایشێکی لایق بەگەورەیی خودای کرد لەپاشان باسی دەجالی کرد فەرمووی من خەبەری هاتنی دەجالتان پێدەدەم کە خەبەردان بەشتێکی بەدە هەر پێغەمبەرێک خەبەری هاتنی دەجالی بەقەومی خۆی داوە هەتا باوکی دووەمی ئادەمیزاد کە حەزرەتی نووحە خەبەری بەقەومی خۆی داوە بەلام من زیاد لە پێغەمبەران لەنیشانەی دەجال قسەیەکی واتان پێدەڵێم هیچ پێغەمبەرێک بەقەومی خۆی نەگوتبێ بۆ خۆتان بزانن چونکی کوێرە یەعنی بەدەو نوقصانەو مەنحوسە ئەوی شەرع پێی ناخۆش بێ بەو عەیبدارە لەسەر پێچەوانەو خلافی رەووشتی خودای گەورە چونکی رەووشتی خودا هەمووی پاکە لەهەموو کەمی و خراپەیەک و بەدی یەک

بۆیێ پێغەمبەر فەرموویتی تخلقوا باخلاق الله واتَّصفوا بصفاته انجا بەقەدەر ئەوەی کەرەووشتت باش بی ئەوەندە لەخودا نزیکی وە لەدەجاڵ دووری وەبەقەدەر ئەوەی رەووشتت خراپ بی لەخودا دووری وە لە دەجال نزیکی ئەمەیە مەعنای [انَّهُ اعور وان الله لَيْسَ بأعْوَرَ]. یەعنی مەبەست لە (اعوَر) کە کوێری یەک چاوە ئەو مەعنا حەقیقی‌یە نی‌یە بەلکە مەبەست لە (اعوَر) ئەوکەسەی پێ مەبەستە کە کەمەوکەچە لەبەر ئەوەی هەموو رەوشتی خراپی هەیە.

٧٧٧: عَنْ حذيفَةَ(ض) اكتبوا لي مَن تلَفظَ بالاسلامِ فكتبنا لَهُ الفاً وخَمْسمائَةِ رَجُلٍ.

**تەرجەمە**

٧٧٧: دەگێرنەوە لەحوزەیفەی کوڕی یەمان رەزای خودای لێ بێ پێغەمبەر(د) فەرمووی ناوی لەدەفتەر بنوسن ئەوی کلیمەی اسلامی بەسەر زاردا هاتبێ کە کەلیمەی شەهادەیە. ئێمەش ناوی هەزارو پێنج‌سەد کەسمان نووسی لەدەفتەر پاشان گوتمان ئێمە دەترسێین کە هەزارو پێنج‌سەد کەسیشین ئنجا بەتەحقیق خۆمانم دیت کەتووشی تاقی‌کردنەوەیەکی خودایی بوبوین لەجەزای شانازیمان بەزۆری خۆمان هەتا بەڕادەیەک پیاوێکمان بەتەنیا نوێژی بکردایە دەترسا لەگەڵ ئەمەی کە لەشکری ئیسلامیش زۆر بوو.

(ش) ئەمە لایقە کە غەزای ئوحود بووبێ یاخۆ لەهەلکەندنی خەندەک بووبێ لەغەزای ئەحزاب.

٧٧٨: عَن جابِرِ(ض) يا اَهْلَ الخَنْدَقِ اِنَّ جابراً قد صَنَعَ سوراً فحيَّهلاً بِكمْ.

**تەرجەمە**

٧٧٨: دەگێرنەوە لەجابری کوڕی عبدالله رەزای خودای لێ بێ گوتی لەغەزای خەندەک گوتم ئەی پێغەمبەری خودا بەرخێکمان کوشتووتەوە صاعێکیش جۆم هاڕدوە ئنجا خۆتو چەند کەسێک لەگەڵ خۆت تەشریف بفەرموون پێغەمبەر(د) فەرمووی ئەی ئەهلی خەندەک بەڕاستی جابر سفرەو خواردنی بۆ ئێمە تەرتیب داوە ئنجا هەمووتان فەرموون بابڕۆین بۆ سەر دەعوەتی جابر. هەزارو پێنج کەس چوونە سەر دەعوەتی جابر کەیەک بەرخۆکەشی کوشتبۆوە هەمووشیان تێر بوون بەزیادی ئەمەش یەکێک بوو لەموعجیزە گەورەکانی پێغەمبەر(د).

٧٧٩: عَن أم خالد (ض) سَنَه سَنَه وهي باللغة الحَبَشيَة حَسَنَةٌ. اَبلي واَخلقي ثُمَّ اَبلي وَاَخلقي ثم اَبْلي واَخْلِقي.

## تەرجەمە

٧٧٩: دەگێرنەوە لە ئومی خالد کە ناوی (أَمَــتــه) بوو کچی خالدی کوڕی سەعیدی امویە بو گوتی لەگەڵ خالدی باوکم هاتمە خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی (سەنە سەنە) بەزمانی حەبەشی واتە کەی ئەمەیە کراسەکەت باشە جوانە پاشان چووم گالتەم دەکرد بەمۆری پێغەمبەرایەتی پیرۆزی کە لەبەینی شانی پیرۆزی بوو پێغەمبەر (د) لەپاش ئەمە باوکم دیتی تێی ڕاخوڕیم پێغەمبەر (د) فەرمووی لێ ی گەڕێ لێ ی گەڕێ وە فەرمووی سێ جاران أبلیٓ واخلقی یەعنی ئەم کراسە کۆن بکەی وە بی دڕێنی یەعنی عومرت درێژبی زۆر جلک کۆن بکەی و بی دڕێنی لەکوردیش ئەوە بەکاردێ ئەگەر یەکێک جلکەکی تازە لەبەر بکا پێ ی دەگوترێ ئەمە بدڕێنی وە هەزاری تر یەعنی زوو نەمری هەتا زۆر جلک کۆن بکەی وە فرەی بدەی ئنجا ئوم خالد زۆرژیا.

٧٨٠: عَن اَبي هُرَيْرَةَ (ض) لا القيَنَّ أَحدكُمْ يومَ القيامَةِ على رَقَبَتِهِ شاةٌ لَها ثغاءٌ. على رقَبَتِهِ فَرَسٌ لَه حَمْحمَةٌ يقول يارسول الله اغثِني فاقول لا املِكُ لَكَ شَيْئاً قد ابلغْتُكَ وَعلى رَقَبَتِهِ بَعيرٌ له رَغاءٌ يَقولُ يارسولُ اغِثْني فاقولُ لا أَمْلِكُ شَيئاً قد ابلغتُكَ وعلى رَقَبَتِهِ صامِتٌ فيقولُ يارسولَ اللّهِ أَغِثْني فاقولُ لا املِكُ شيئاً قد ابلغتُكَ على رقبته رِقاعٌ تخفِقُ فيقولُ يارسولَ اللّهِ أَغِثْني فاقولُ لا املِكُ لَكَ شيئاً قد ابلغتُكَ.

## تەرجەمە

٧٨٠: دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی ڕۆژێک پێغەمبەر (د) لەخوتبە قسەی لەئەحوالی خائن دەکرد. دەی فەرموو ئێوە لەدونیا شتێکی وامەکەن کە لەقیامەت تووشی یەکێکتان ببم مەڕێکی لەسەر مل و شانی بی و بارە باڕیش بکا بۆ ئابڕووچوونی لەناو مەخلوقاتی سەرەتاو دوایی وولاغێک لەسەر شانی بی بەحەم حەمەکردن وەکو لەکاتی کە هەوەسی دەچێتە ئالیک ئنجا بلێ: ئەی پێغەمبەری خودا لەهاوارم وەرە منیش بلێم هیچم بۆ تۆ پێ ناکرێ لەلایەن خودای گەورەوە. بەڕاستی حوکمی خودام بەتۆ ڕاگەیاند لەدونیا دەبایە بەگوێرەی فەرمانی خودا بجوولێیەوە تا ئیمڕۆ تووشی ئەم ئابڕووچوونەو عەزابە نەهاتبای وە لەسەر مل و شانیشی هەبێ ووشترێک قوڕەقوڕ هاوار بکا بلێ ئەی

پێغەمبەری خودا لەژێر ئەم بارە گرانە نەجاتم بدە منیش بلێم هیچم بۆت پێ ناکرێ من بەتۆم ڕاگەیاند. لەملی هەبێ چەند کۆنە جلک و پەڕۆک کە دەجوولێنەوە بە جوولانەوەی بایەکانی جۆربەجۆر ئنجا بلێ ئەی پێغەمبەری خودا لەهاوارم وەرە منیش بلێم هیچم بەدەست نی‌یە بۆ تۆ بەهەر حوکمێکی کە ڕاسپرام بەتۆیشم گوت.

(ش) ئەم حەدیثە پیرۆزە تەفسیرە بۆ ئایەتی [وَمَن يغْلُلْ يأتِ بما غَلَّ يوم القيامَةِ] یەعنی لەدونیا خیانەت لەهەر شتێک بکەی ڕۆژی قیامەت ئەو شتە لەسەر ملت دادەندرێ بەوشتەوە لەناو مەخلوقات ڕادەوەستیو حەشرت لەگەڵ دەکرێ [اللهُمَّ اعذِنا من الخيانَةِ والمسؤلية بجاه القرآن وبجاه مَن أنزَلْتَ عليهِ القُرآنَ].

واتا خودایە بمان پارێزە لە خیانەت و لێ پرسینەوە لەبۆ خاتری قورئان و بۆخاتری ئەوەی بۆت هەناردووە (دوعای مترجم).

٧٨١: عَن عبدالله ابن عمر (ض) هوَ في النأرِ.

### تەرجەمە

٧٨١: دەگێڕنەوە لەعبدالله کوڕی حەزرەتی عومەر ڕەزای خودای لێ بی گوتی پیاوێک هەبوو ناوی [کەڕ کەڕە] بوو چاوەدێری شتی گرانباری پێغەمبەر (د)ی دەکرد لەکاتی کوشتاریش سەری وولاغی بۆ دەگرت بەندەیەکی ڕەش بوو. وەکوو مرد پێغەمبەر (د) فەرمووی لەسەر گوناهی خۆی لەئاگردایە ئەگەر خودا عەفووی نەکردبێ ئەصحابیش. چوون تەماشای بکەن دیتی یان لەماڵی -غەنائم- واتە تالانی کافران. عەبایەکیان دۆزیەوە خیانەتی کردبوو.

(ش) ئەمە دەلیلە کە حوکمی خائن لەماڵی کەم و زۆر وەکوو یەکە.

٧٨٢: عَن انَس (ض) قالَ كُنَّا مَعَ النبيِّ صلَّى الله تعالى عليه وسلم مقْفَلَهُ مِن عسفانَ ورسولُ اللَّهِ على راحِلَتِهِ وَقَدْ اردَفَ صفيةَ بِنْتَ حُيي فعثَرَت ناقَتُهُ فصُرِعا جَميعاً فاقتَحمَ أبو طَلحَةَ فقالَ يا رسولَ اللَّهِ جَعَلني فِداءَكَ. فقالَ عَلَيْكَ المروءَةَ فقَلَبَ ثوباً على وَجْهِهِ واتاها فالقاهُ عَلَيْها واصلَح لَهما مَركَبهما فرَكِبا فاكتنفنا رسولَ اللَّه صلى الله تعالى عليه وسلم فلَما أسرَفنا على المَدينةِ قالَ آيبونَ تائبونَ عابدون لِرَبِّنا حامدونَ لم يَزَل يقول ذلك حتى دَخلْنا المدينةَ.

## تەرجەمە

٧٨٢: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی لە خدمەت پێغەمبەر بووین لەگەڕانەوەی لەغەزای عوسفان کە دوو قۆناغ لەمەککەوە دوورە پێغەمبەر (د) لەسەر ووشتری خۆی بوو حەزرەتی صفیەی کچی حویەیی هاویشتبووە پشت خۆی ووشترەکەی هەڵەنگوت هەردوویان لەسەر ووشتر بەربوونەوە خوارێ زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصاری کە ناسرابوو بە ئەبو طەلحە خۆی فڕەدا خوارێ لەووشتر غاریدا بۆ خدمەت پێغەمبەر (د) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا خودا من بەقوربانی تۆ بکا. فەرمووی لەمن واز بینە بچۆ لای ئافرەتەکە ئەبو طەلحەش بەشمەیەک سەرو ڕووی خۆی داپۆشی نەوەک چاوی بە صفیە بکەوی چووەلای سەرپۆشەکەی بەسەر صفیەداداو نەوەک ببینرێ ووشترەکەی باش بۆ ڕێک خستنەوە دووبارە سواربوونەوە ئێمەش پێغەمبەرمان لەناوخۆمان گرت وە دەورەمان لێ دا وەکوو لەمەدینە دیارکەوتین پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی خودایا ئێمە گەڕاینەوە بۆ لای تۆ ئێمە لەهەموو گوناهان گەڕاینەوە بۆ لای خودا وە ئێمە خودا دەپەرستین وە ئێمە سوپاس و ستایشی خودا دەکەین ئیتر زیکری هەر نەمەبوو هەتا چووینە مەدینە.

(ش) حافظی دمیاطی دەڵێ کەوتنی پێغەمبەر (د) و صەفیە لەغەزای عەسفان نەبوو کە لەساڵی شەشەمی کۆچی بوو بەڵکی لەغەزای خەیبەر بوو کە لەساڵی حەوتەم بوو.

## ٧٨٣: عَن جابرٍ (ض) أَحْسَنْتِ الأنصارُ سَمّوا بأسمي ولاتكنُّوا بِكُنْيتي فأنَّما أنا قاسِمٌ.

## تەرجەمە

٧٨٣: دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبدالله ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی گوتی ئەنەسی کوڕی فوضالەی ئەنصاری کوڕێکی بوو ناوی لێ نا قاسم. ئەنصار گوتیان پێت نالێین ابو القاسم وپێشت نالێین چاوت ڕۆن کە کوڕت بووە ئەنەسی کوڕی فوضالەی چووە خدمەت پێغەمبەر (د) پێی گوت ئەی پێغەمبەری خودا کوڕێکم بووە ناوم لێ ناوە قاسم ئەنصاریش گوتیان ئێمە بەتۆ نالێین ابو القاسم دەربارەی بوونی کوڕەکەت پێت نالێین چاوت ڕۆن پێغەمبەر (د) فەرمووی ئافەرین بۆ ئەنصار قسەیەکی باشیان کردووە. ناوی من لەمنداڵی خۆتان بنێن بەڵام کونیەم کە ئەبولقاسمە چونکی نازناوی منەو تایبەتە بەمن جگە لەمن بۆ کەسی تر بەکاری مەهێنن پاشان بەڕاستی من (قاسمم) واتە بەش کەرم ماڵی میراتتان لێ بەش دەکەم ماڵی تالانی کافرانتان لێ بەش دەکەم بەئەمری خودای

گەورە ئنجا لەکەسی تر ناوەشێتەوە قاسم بۆ بەڕاستی پێغەمبەر نەبێ. اللهم صل عليه وعلى انصاره ومهاجريه واتباعه امين.

(ش) ئیمامی شافعی وەکوو مەزهەبی ئەهلی ظاهر حوکمی کردووە بەوەی کە نابێ کەس کونیەی ابو القاسم بەکاربێنێ چونکە کونیەو نازناوی پێغەمبەرە لەئیمامی مالکیش دەگێڕنەوە دروستە ابو القاسم بەکاربێ بۆ هەموو کەس چونکە ئەو قەدەغەکردنە هەر بۆ زەمانی پێغەمبەرە نەوەک خەڵکی تر نازناوی لەگەڵ پێغەمبەر جیانەکرێتەوە کوڕی جەریریش گوتیتی ئەم نەهیە بۆ تەنزیهـو ئەدەبە بۆ حەرام کردن نیە هەندێکی تریش گوتوویانە بەکەسێک بگوترێ ابو القاسم کە ناوی محمد بێ زەرەری نییە تەنیا کونیە بۆ کەسێک بەکاربێ نابێ. خولاصە لەبەر احتیاط کەسێک کونیەو نازناوی خۆی نەکاتە ابوالقاسم باشترە.

٧٨٤: عَن اَبي هُرَيْرَةَ (ض) ما اُعْطيكُمْ ولا اَمْنَعُكُمْ انا قاسِمٌ اَضَعُ حيث اُمِرْتُ.

### تەرجەمە

٧٨٤: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی من بەئێوە نادەم بەڵکی خودا بەئێوە دەدا وە لەئێوەش نابڕم بەڵکی ئەوی بی بڕی ئەوی بیدا هەر خودایە من دابەش دەکەم لەسەر ئەمرو فەرمانی خودا نەک بەڕەئی خۆم. ئنجا کەسێک ئەگەر کەمی پێ بدەم بەدانانی خودایە وە ئەگەر زۆریشی پێ بدەم بەدانانی خودایە چونکی هەرچی هەیە بە ایجادی خۆیەتی چی جایی بەملکایەتی مايفتح الله للناس من رحمة فلا مُمْسِكَ لَها ومايُمسِكُ فلا مُرسِلَ لَهُ مِنْ بَعْدِهِ ئەم ئایەتە پیرۆزە بو بەشاهیدی حەدیث.

٧٨٥: عَن خَولَةَ (ض) اِنَّ رجالاً يَتَخوَّضونَ في مالِ اللّه بغيرِ حقٌ فَلَهُم النّار يَومَ القيامَةِ.

### تەرجەمە

٧٨٥: دەگێڕنەوە لەخەولەی ئەنصاریە کچی قەیسی کوڕی فەهر. خێزانی حەمزەی کوڕی عبدالمطلب رەزای خودایان لێ بێ گوتی بیستم لە پێغەمبەر(د) دەی فەرموو بەڕاستی هەندێ پیاو هەن دەسکاری ماڵی خودا دەکەن یەعنی لەوماڵەی کە خودا دایناوە بۆ پەرژەوەندی موسوڵمانانی کارەکەشیان بەناحەقە یەعنی لەغەیری جێگای شەرعی دەدۆڕێنن یاخۆ بەبێ عەدالەت لەموستەحەقان دابەش دەکەن بۆ ئەوانە ئاگر ڕۆژی قیامەت.

٧٨٦: عَن ابي هُرَيْرَةَ (ض) غَزا نبيٌّ مِن الأنبياء فقال لِقَومِهِ لايَتْبَعْني رَجُلٌ مَلَكَ بُضْعَ امَراةٍ وهو يُريدُ أن يَبنيَ بِها ولَمّا يبْنِ بِها ولااحدٌ بنى بيوتاً ولَمْ يرْفَعْ سُقوفَها ولا أحدٌ اِشترى غَنَماً أو خَلَفاتٍ وهْوَ يَنْتَظِرُ ولادَها فَغَزا فَدَنا مِنَ القَرْيَةِ صَلاةَ العَصْرِ او قَريباً مِن ذلِكَ فقال لِلشَمس إنَكِ مأمُورَةٌ وانا مأمورٌ اللهُمَّ احبِسها عَلَينا فَحبَسَت حتّى فَتَح اللّهُ عَلَيهِ فجَمَعَ الغنائِمَ فجاءَت يَعني النّارَ لِتَأكُلَها فَلَمْ تَطْعَمْها فقالَ اِنَّ فيكُمْ غُلولاً فَلْيبايِعْني مِنْ كلِّ قَبيلَةٍ رَجُلٌ فَلَزِقَت يَدُ رَجُل بِيَدِهِ فقالَ فيكم الغُلولُ فيُبايعني قَبيلَتُكَ فَلَزِقَت يَدُ رَجُلَيْنِ او ثلاثةٍ بِيَدِهِ فَقالَ فيكُمْ الغُلولُ فجاءوا برَئسٍ مِثْلَ رَاس البقَرَةِ مِن الذّهَبِ فوضَعوها فجاءَتِ النارُ فأكَلَتْها ثُمَّ اَحَلَّ اللّه لنا الغنائِمَ راي عَجْزَنا فاحلَّها لَنا.

## تەرجەمە

٧٨٦: دەگێڕنەوە لەئەبو هوریرە رەزای خودای لێ بێ گوتی پێغەمبەر(د) یوشەعی کوڕی نون فەرمووی کە ئەویش پێغەمبەر بوو کە لە پاش موسی ئەو کرا پێغەمبەر ویستی غەزا بکاتە سەر ئەریحاو شەڕیان لەگەڵ بکا عالەمێکی زالم و ستەمکاری لەناوبوو بەقەومەکەی خۆی گوت باکەسێک نەکەوێتە شوێن من بۆ غەزا ژنێکی داخوازکردبێ هێشتا نەی گوزتبێتەوە بشی یەوێ بیگۆزتەوە وەنەوکەسەش نەکەوێتە شوێن من چەند خانوەکی دروست کردبێ سەریان نەگیرابێ وەنەو کەسەش نەکەوێتە شوێن من بۆ غەزا مێگەلە مەڕێکی ئاوسی کریبێ یا مێگەلە ووشترێکی ئاوسی کریبێ هێشتا نەزابن ئەویش چاوەڕێی زانیان بکا ئنجا یوشەع پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ بەخۆیو لەشکری بەنی اسرائیل رۆیشت بۆ سەر ئەریحا لەنوێژی عەصر گەیشتە ئەریحا یاخۆ نزیک بوو نوێژی عەصربی راستەوخۆ بەرۆژی گوت تۆ بەئەمری خودا فەرمانت پێکراوە بەئاوابوون منیش بەئەمری تەکلیف لەلایەن خودا فەرمانم پێکراوە بەنوێژکردن یارەبی واتە ئەی خودایە رای بگری ئاوانەبێ هەتا لەم کوشتارە دەبینەوە ئنجا رۆژ راگیرا ئاوانەبوو هەتا خودا وولاتەکەی بۆ فەتح کرد تالان و غەنائم کۆکرایەوە [عادەتی پێغەمبەرانی پێشووش غەیری پێغەمبەری خۆمان (د) وابووە تالانی کافران لەوان حەرام بووە ئاگرێک لەئاسمان دەهات مالی کافرانی هەموو دەسووتاند). ئنجا دیتی یان ئاگرهات بەلام نەهیچی خوارد وە نەهیچی سووتاند حەزرەتی یوشەع سەلامی خوای لێ بێ گوتی لەئێوەدا خائن هەیە ئنجا لەهەر قەبیلەیەک پیاوێک بێ موبایەعەو موعاهەدەم لەگەڵ بکا لەسەر خیانەت نەکردن. پیاوێک لە قەبیلەیەک هات موبایەعەی لەگەڵ کرد دەستی بەدەستی

یوشەع پێغەمبەر وەنووسا گوتی دیاربوو قەبیلەی تۆ خیانەتی لەناو هەیە هەموویان دەبێ بێن موبایەعەم لەگەڵ بکەن. ئنجا دەستی دووپیاو یا سێ پیاو بەدەستی وەنووسان. یوشەع گوتی ئەوا بەدیارکەوت ئێوە خاینن بزانم چیتان کردووە ئنجا چوون سەرکێکیان هینا لەزێڕ وەکوو سەرکە مانگابوو دایان نا عارد ئاگرهات غەنائمی هەموو خوارد. لەپاش پێغەمبەران خودا غەنائمی کافرانی بۆ ئێمە حەلال کرد چونکی لەخودا مەعلوم بوو کە ئێمە زەعیف و دەست کورت و عاجزین.

(ش) لەبەر قصوری ئومەتەکانی پێشوو لە اخلاص غەنائم بۆیان حەرام بووە نەوەک بەنیەتی مالی دونیا جهاد بکەن بەلام ئومەتی محمد لەبەر ئەوەی زۆر دلسۆزو موخلص بووینە غەنائمیان لۆ حەلال کرا. لەڕاستیشدا هەروابوو. کوشتاریان هەر بۆ ڕەزای خودا بوو بۆ تالانی کافران نەبوو هەروەکو شوێنەوارو کرداریان شاهێدیان بۆ دەدا.

٧٨٧: عن جابر (ض) شَقِيتَ اِنْ لَمْ اعْدِلْ.

### تەرجەمە

٧٨٧: دەگێڕنەوە لەجابری کوڕی عبدالله ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەقتێک پێغەمبەر (د) تالانی هەوازنی دابەش دەکرد لە (جعرانه) پیاوێک ناوی ذو الخویصرەی تەحیمی بوو گوتی بەعەدالەت بە. پێغەمبەر (د) فەرمووی تۆ ڕێ بزردەکەی ئەگەر من عەدالەت نەبم چونکی تۆ تابعی منی وە لەدوومن دەڕۆی ئەگەر من عادل نەبم دەبی تۆش عادل نەبی بەلکی لازم دێ تەواوی ئومەت بێ عەدالەت بێ لەبەر ئەوەی چونکە دەبی هەموو ئومەت بەقسەی پێغەمبەر بکاو اقتداو گوێ ڕایەڵی بکەن لەهەموو ڕەفتارو گوفتار.

٧٨٨: عَن عبدالرحمن ابن عوف (ض) اَيّكما قَتَلَهُ قالَ كل واحِدٍ منهما انا قَتَلْتُهُ. فقالَ هَلْ مسحتما سيفكُما قالا لا. فَنَظَر في السَّيْفَيْنِ فَقالَ كِلاكُما قَتَلَهُ.

### تەرجەمە

٧٨٨: دەگێڕنەوە لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەغەزای بەدر لەڕێزی شەڕکەران ڕاوەستابووم تەماشای لای ڕاست و لای چەپی خۆم کرد دیتم من لەبەینی دوو منالی تازە پێ گەیشتوو ڕاوەستاوم منیش ئارەزووم کرد لەجێگاییکی باشتر

بومایه كه ئی وەكوو منی لێ بوایه بەلكی كوشتارم باشتر پێ دەكرا لەبەینی ئەم دوو منالە هیـچم پێ ناكرێ من لەم خەیالە دابووم یەكێكیـان ئیشـارەییێكی چاوی بۆ كردم و گـوتی ئەرێ مامە تۆ ئەبو جەهل دەناسی كە عەمری كوڕی هشامە فیرعەونی ئەم ئومەتەیە. گوتم ئەی ناسم بەلآم چی ئیشت بە ئەبو جەهلە. گوتی خەبەرم پێ دراوە جنێو بە پێغەمبەر دەدا بەحەقی ئەو زاتەی كـە ڕوحی منی بەدەستـە شـەخصم لەشـەخصی جودا نابێتـەوە هەتا هەركامە لەهەردوومان ئەجەلی زووتر هاتووە نەمری. منیش سەرم سوڕما لەقسـەكەی دیتم ئەویتریش ئیشـارەییێكی چاوی بۆ كردم و بێ تەفـاوت وەكو ڕەفیـقـەكەی هەڕەشەی لەئەبو جەهل كرد هەندەی پێ نەچوو دیتم ئەبو جەهل لەناو لەشكر دەجوولایەوە بێ قەرار بوو زوو زوو جێگای خـۆی دەگـۆڕێتەوە منیش بەمنالەكـانم گـوت ئەم كـەسـەی كـە هەردووكـتـان دەتانەوێ ئەمـەیە. هەردوویان غـاریاندا سـەری بەشـیـر: لێیاندا بەشـیـری خـۆیان هەتا كوشتـیـان. ئنجا گەڕانەوە بۆ خدمەت پێغـەمـبـەر پێغـەمـبـەر (د) خەبەری كوژرانی ئەبو جەهلیـان دایێ فەرمـووی كـامـەتان كوشتـتـان هەركەسە گوتی من كوشتم فـەرمـووی شیری خـۆتان -نەسـتـریتـەوە؟ گـوتیـان نـا. پێغـەمـبـەر (د) تەمـاشـای شـیـری هەردوویانی كـرد فـەرمـووی هەردووتان كـوشتـووتانە. [ئەم دوومنالەشی یەكێكیـان مەعـاذی كوڕی عـەمـری كوڕی جموحبوو ئەویتریان مەعاذی كوڕی عەفرابوو) ئنجا چەكو جلەكانی ئەبو جەهلی دایە مەعاذی كوڕی عەمر.

(ش): پێـغـەمـبـەر (د) لەپاش تەمـاشـاكـردنی شـیـریان كـە فـەرمـووی هەردووتان كوشتووتانە بو چاكردنەوەی دلی هەدوویان بوو ئەگەر بەقەرینەی ئەوەی چەكو جلكەكانی دا بەمـەعـاذی كـوڕی عـەمـر: كـوژەر مـەعـاذی كـوڕی عـەمـر بووە. هەروەكـوو طه حـاوی وای فەرمووە. مالكیـەكانیش ووتوویانە ئیمام سەرپشكە «موخەیەرە» لەوەی كە تالآنەكە بداتە هەركـامیـان: یەعنی ئیـمـامی مـالک دەلێ مـادام پێغـەمـبـەر (د) فـەرمووی هەردووتان كوشتووتانە هەردوویان كوشتوویانە بەلآم ئیمام سەرپشكە بۆ دانی تالآن بەهەركامیان.

٧٨٩: عَن انس (ض) ماكان حديثٌ بَلَغَني عَنْكُمْ إنّي أُعطي رجالاً حديثٌ عَهدُهُم بِكُفرٍ. اما ترضَوْنَ اَن يَذْهَبَ الناسُ بِالأموالِ وتَرجِعونَ اِلى رحالِكُم برسول اللّهِ صَلّى الله تعالى عَيه وسَلَّم قالوا بلى يارسول الله قد رَضينا فقالَ لَهُمْ إنكُمْ ستـرَوْنَ بَعدي أُثْرَة شديدةً فاصبِروا حتّى تلقوا اللّه ورسولَهُ صلى الله تعالى عليه وسلم على الحَوْضِ.

## تەرجەمە

٧٨٩: دەگێڕنەوە لەئەنەسی کوڕی مالک ڕەزای خودای لێ بی گوتی پێغەمبەر (د) لەتالان و غەنیمەتی ماڵەکانی هەوازن هەرکەسی خەلکی مەکە بوو تازە موسولمان ببوون هەریەکی سەد ووشتری پێ دا ئەنصار گوتیان خودا پێغەمبەر عەفوو بکا ئەم هەموو مالی زۆری بەئەهلی مەکەدا کەشیری ئێمەش لەخوێنی ئەوان ئێستاش تکە دەکا ئێمەشی هێشتەوە بێ ئەوەی چمان بداتێ. ئەم قسەی ئەنصار گەیشتە پێغەمبەر (د) ناردیە شوێن ئەنصار هەمووی لەخێوەتێکی چەرم کۆکردنەوە لێ نەگەڕا غەیری ئەنصار هیچ کەس لەوێ بی وەکوو هەموو کۆبوونەوە پێغەمبەر (د) چووەلایان فەرمووی چیە ئەم قسەیە لەلایەن ئێوەم پێ گەیشتووە؟. پیاوەکانی تێ گەیشتوو گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئەم قسەیە لەپیاوە عاقل و تەواوەکانمان نەگوتراوە. بەڵام بەڕاستی تازە پێ گەیشتوەکان و گەنجەکانمان عەینی ئەم قسەیان ئەگەرچی کرد بەڵام قسەی ئەوان لای ئێمە بێ قیمەتە پێغەمبەر (د) فەرمووی من ماڵ دەبەخشم بەو پیاوانەی تازە موسولمان بوونە لەمێژ نییە لەکفر جودا بووینەوە بۆ وەرگرتنی دلّیان. ئەرێ ئێوە ڕازی نین ئەوان بەماڵی دنیاوە بگەڕێنەوە بۆ مەککە ئێوەش بەپێغەمبەری خوداوە بگەڕێنەوە بۆ ئوردوگاهی خۆتان. قەسەم بەخودا ئەوی ئێوە پێ دەگەڕێنەوە باشترە لەوی ئەوان پێ دەگەڕێنەوە گوتیان بەلێ وایە فەرموودەی تۆیە ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی و بەبێ گومان ئێمە ڕازین. پاشان پێغەمبەر (د) فەرمووی ئێوە لەپاش من دەبینن چەند فەرمانداریێک کە ماڵ بەئێوە نادەن بەلکو دەدەنە غەیری ئێوە بەناحەق (نەک لەبەر حیکمەتێک وەکوو من دەرحەق بە ئەهلی مەکە). ئنجا خۆتان ڕاگرن لەپێش موقەدەرات هەتا دەگەنە خدمەت خوداو پێغەمبەری خودا لەسەر حەوزی کەوثەر.

٧٩٠: عَن جُبَيرِ مُطعِم (ض) أعْطوني ردائي فَلوكانَ عَددُ هذِه العِضاةِ نَعَماً لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ ثُمَّ لاتجِدوني بَخيلاً ولا كَذوباً وَلا جَباناً.

## تەرجەمە

٧٩٠: دەگێڕنەوە لەجوبەیری کوری موطعیم ڕەزای خودای لێ بی. کاتێک لەلای پێغەمبەر بووین لەگەڵ خەلکی تر وەکوو لەغەزای حونەین هاتەوە قەومێکی زۆر لەعەرەبەکانی بیابان نشین دەورەیان لە پێغەمبەردا بەدەست و دامەنی وەنووسان کە ماڵی غەنیمەتیان پێ بدا. بەناچاری پەنایان بردە لای داری سمرە (سەمرە: دارێکی دڕکاوییە

گولێکی زەردی هەیە). دڕکی دارەکە کورتەکی پێغەمبەری گرت ڕاوەستا فەرمووی کورتەکەکەم بدەنەوە ئەگەر بەقەدەر ئەم هەموو دارە درکاویانەی گەورە ووشترو وولاغ و کاران بی لێتان دابەش دەکەم پاشانیش نامبینن ڕەزیل بم ناشمبینن درۆزن بم یەعنی لەسەر وەعدەی خۆم پێتان نەدەم وە ناشم بینن ترسنۆک بم (یەعنی ناترسێم فەقیر بیم».

٧٩١: عَن عبدالله (ض) فَمَنْ يَعدِلْ إذا لمْ يَعْدِلِ اللّهُ ورسولُهُ رَحِمَ اللّهُ موسى قَد أوذيَ باكثَر مِنْ هذا فصَبَر.

**تەرجەمە**

٧٩١: دەگێڕنەوە لەعبداللەی کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بی گوتی لەغەزای حونەین پێغەمبەر (د) دەربارەی غەنائم (تالانی کافران) زۆری بەهەندەکان دا لەبەر حیکمەتێک مەثەلەن سەد ووشتری دایە ئەقرەعی کوڕی حابسی مەجاشعی چونکی یەکێک بوو تازە موسولمان ببوو سەد ووشتریشی دایە عویەینەی کوڕی حصنی فزاری وەکوو ئەویش تازە موسولمان ببوو. دایە هەندێکی تر لەناودارانی عەرەب سەد سەد لەدابەش کردنی غەنائم ئەوڕۆژە ئەشرافەکانی عەرەبی پێش خست لەسەر ئەوانی تر موعتەبای کوڕی قوشەیری منافق گوتی والله ئەم دابەش کردنە عەدالەتی تیا نەکرا وە ئیرادەی ڕازی بوونی خوداشی تیا نەکرا. منیش گوتم والله قسەی ئەم منافقە بەپێغەمبەر دەلێم چوومە خدمەت پێغەمبەر پێم گوت فەرمووی کەوایە کێ عەدالەت دەکا وەکوو خوداو پێغەمبەری خودا عەدالەت نەکەن ڕەحمەتی خودا لەموسابێ بەڕاستی لەمەز یاتر قسەی پێ گوتراو ئەزیەتی درایە صەبرو ئارامیشی گرت سەلامی خوای لێ بی.

(ش): نەسەلمێندراوە -ثابت نەبووە- کە پێغەمبەر (د) ئەو منافقەی سزا دابێ لەوانەیە لەسەری ثابت نەبووە چونکە ئەوی قسەکەی لەوی گێڕایەتەوە هەریەکێک بووە بەشاهیدی یەکێک خوێن ناڕژێ یاخۆ قسەکەی بەئاشکرا دژی پێغەمبەرایەتی نەبووە بەلکی لەم دابەش کردنە تەرکی عەدالەتی نسبەت وەباڵ داوە ئەوەندەش موجبی کفر نی‌یە «منیش دەلێم: واتە موتەرجیمی ئەم حەدیثانە: بەئیلتزام موجبە لەپاش ثبوت ئەبێ بکوژرێ».

٧٩٢: عَنْ عَمرو ابنِ عَوفٍ الأنصاري (ض) اظنكُم قَدْ سَمِعْتُمْ انَّ ابا عُبَيْدةَ قد جاءَ بِشَيْءٍ قالوا أجَلْ يارسولَ اللّهِ قالَ فأبْشِروا وَأمِلُوا مايَسُرُّكم فوَاللّهِ لا الفقْرَ أخشى عَلَيكُمْ أن تبسُطَ عليكُمْ الدنيا كما بُسِطَت على مَن قبلكُمْ فَتَنافسوها كما تنافسوها وتُهلِكَكُم كما اهْلَكَتْهُمْ.

## تەرجەمە

٧٩٢: دەگێڕنەوە لەعەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری ڕەزای خودای لێ بی حەلیف و سوێند خۆر بوو لەگەڵ قەبیلەی بەنی عامر کوڕی لۆی ئەهلی مەکە ئنجا وەهم نەچی ئەهلی مەککە بووە. بەدریش بووە (واتا لەشەڕی بەدر بەشداربووە) گوتی پێغەمبەر (د) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحی ناردە بەحرەین جزیەی ئەوێ بێنی چونکە پێغەمبەر (د) لەساڵی وفود کەساڵی نۆیەمی هیجری بوو صولحی لەگەڵ کردبوون علائی کوڕی حەمزەی بەئەمیر لەسەر تەعین کردبوون ئەبو عوبەیدە لەجزیەی بەحرێن سەد هەزار دیناری هێنا لەگەڵ نوێژی سبەینە گەیشتە مەدینە ئەمە یەکەم خەراجبوو کە بۆ پێغەمبەر هات. ئەنصار خەبەری هاتنەوەی ئەبو عوبەیدەیان زانی بوو. نوێژیان لەگەڵ پێغەمبەر کردو هەلستان تەشریفی ڕۆیشت ئەنصار خۆیان نیشاندا- خۆیان نیشانی پێغەمبەردا پێغەمبەر (د) گرژیەوە وەکوو چاوی پێ‌یان کەوت فەرمووی واتێ دەگەم بیستووتانە ئەبو عوبەیدە هاتووتەوە شتێکیشی هیناوە. گوتیان بەڵێ وایە ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی موژدەتان لێ بێ و ئومێدی فەرەح و کەیف خۆشی و فرەوانیشتان هەبێ. سوێندم بەخودا من ناترسم لەئێوە فەقیربن بەلام دەترسێم مالی دونیاتان زۆر پێ بدرێ هەمووتان دەولەمەند بن وەکوو عالەمی پێش زەمانی خۆتان ئێوەش حەسوودی بەیەکتر ببەن وەکوو ئەوانی پێش ئێوە حەسوودیان بەیەکتری برد لەسەر مالی دونیا هەمووتان بەهیلاکبدا ئەو دونیایە هەروەکوو ئەوانی پێش ئێوەی بەهیلاکدا.

٧٩٣: عَن عبدالله ابن عمرو (ض) مَنْ قَتَلَ مُعاهَداً لم يَرَحْ رائِحةَ الجنَّةِ وإنَّ ريحها يوجَدُ مِن مسيرَةِ أربعينَ عاماً.

## تەرجەمە

٧٩٣: دەگێڕنەوە لەعەبدالڵەی کوڕی عەمری کوڕی عاص ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی هەرکەسێک ذیمی‌یەک بکوژی (ذمی دیان یاخۆ جوولەکە لەوولاتی ئیسلام). بەناحەق بێنی خۆشی بەهەشت بێن ناکا کە بۆنی بەهەشتێش ڕێگای چل ساڵ دەڕوا. واتا هەستی پێ دەکرێ. لەسەر حوکمی ظاهرو دیاری ئەم حەدیثە پیرۆزە وادەگەیەنی ئەگەر کەسێک بێگانەیەک لەژێر ئەمان و عەهدی بکوژی یاخۆ جولەکەو دیانێکی بکوژی دەبی لەبەهەشت مەحروم و مەئیوس بی بەلام مەعنای ئەم حەدیثە لای ئەهلی سونەت و جەماعات لەگەڵ سابقێن کە موقەرەبەکانن ناچی وە بێنی بەهشتیش ناکا

لەگەڵ ئەوکەسانەی کە لەڕێگای چل ساڵ بێن دەکەن بەلکی لەگەڵ ئەو کەسانە بێن دەکا کە لەڕێگای کەمتر لە چل ساڵ بێن دەکا چونکی ئەوانەی خەڵک دەکوژن و گوناهە گەورەکانی تر دەکەن لەئاگر هەتا هەتایە نامێنیتەوە یاخۆ گوتویانە ئەم حەدیثە پیرۆزە لەمەقامی تەهدیدو هەڕەشە هاتووە.

٧٩٤: عَن أَبي هريرة (ض) إجْمَعوا لي مَن كانَ هيهنا مِنْ يَهودَ فَجُمعوا لَهُ فقَالَ لَهُم إنّي سائِلكُمْ عَن شئ فَهلْ أنتُم صادِقِيُ مِنْهُ فَقالوا نَعَمْ. قالَ لَهُم النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم مَن أبوكُمْ قالوا فلانُ قالَ كذبتُمْ بَلْ أبوكم فلانُ قالوا صَدَقْتَ. قال فهَلْ أنتم صادِقِي عن شئ إن سألْتُ عنه فقالوا نَعَمْ يا ابا القاسم وإن كذبْنا عَرَفْتَ كِذبَنا كما عرفتَهُ في أبينا فقالَ لَهُم من أهلُ النّار قالوا نكونُ فيها يسيراً ثمَّ تخلفونا فيها. فقالَ النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم، اخسَئوا فيها وَاللّهِ لاتخلفُكُمْ فيها أبداً. ثم قالَ هَلْ أنتم صادقيَّ عن شئ إن سئلتكُمْ عَنْهُ فقالوا نعم يا ابا القاسم قالَ هَلْ جَعَلْتُم في هذه الشّاةِ سُّماً قالوا نَعَم. قالَ ماحَمَلَكمْ عَلى ذلِكَ. قالوا أردْنا إن كنتَ كاذِباً نستريحُ وان كنتَ نَبيّاً لَمْ يَضُرَّكَ.

## تەرجەمە

٧٩٤: دەگێڕنەوە لە ئەبو هوڕیرە ڕەزای خودای لێ بی گوتی وەکوو خەیبەر فەتح کرا زەینەبی کچی حارثی جوولەکە مەڕێکی کوڵاوو بەژەهر لێنراوی نارد بۆ پێغەمبەر (د) خودا وەکوو بەالهام ئاگاداری کرد لەم کارە -واتە خستی‌یە ناو دلی کە ئەم مەڕە زەهراویە فەرمووی هەرچەند جوولەکەیەکی لێرە هەیە بۆم کۆبکەنەوە هەموو کۆکرانەوە پێغەمبەر (د) فەرمووی من لەشتێک لێتان بپرسم ڕاستم پێ دەلێن گوتیان بەلێ فەرمووی باوکتان کێیە گوتیان فلانە فەرمووی درۆتان کرد باوکتان فلان کەسە گوتیان ڕاست دەکەی فەرمووی ئەمجارە ئەگەر شتێک لێتان بپرسم ڕاستم پێ دەلێن گوتیان بەلێ ئەی ابو القاسم ئەگەر ئێمە درۆ بکەین تۆ دەزانی هەروەکو زانیت دەربارەی باوکمان. فەرمووی کێ دەچیتە ئاگر گوتیان ئێمە کەمێک لەناو ئاگر دەبین پاشان ئێوە دەبنە جێ نشینی ئێمە پێغەمبەر (د) فەرمووی چەغەبن یەعنی وەک سەگ مەوەڕن بەحەقی خودا ئێمە نابینە جێ نشینی ئێوە یەعنی نالێم ئەشقیای اسلام تووشی ئاگر نابی بەلام تووشبوونەکەیان کاتی‌یە (موەقەتە) هەتا هەتایە نی‌یە. بەلام جگە لەئیسلام لەجوولەکەو غەیری جوولەکە هەتا هەتایە لەئاگردا دەبن دەرچوونیان لەئاگر قەدەغەیە ئنجا جێ نیشینتان لەکوێ بوو کە

مەعنای خلافەت تصور نەکرێ. دیسان پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەمجارە ڕاستم پێ دەڵێن ئەگەر پرسیارێکی ترتان لێ بکەم گوتیان بەڵێ ئەی ابو القاسم فەرمووی ئایا زەهرتان لەمەڕەکەی کە بۆمنتان کوشتبۆوە کردبوو؟.

گوتیان بەڵێ: فەرمووی بۆچی واتان کرد گوتیان بەم ئیرادەیە وامان کرد ئەگەر درۆزن بی لەیەقەمان دەبییەوە وە استراحەت دەکەین ئەگەر پێغەمبەریش بی هیچ زیانی بۆت نابی.

پێغەمبەر (د) عتابی لەژنە جولەکەکە نەگرت بە پێغەمبەریان گوت کە بیکوژین فەرمووی مەیکوژن - زوهری گوتیتی ژنەکە موسولمان بوو وازیشی لەکوشتنی هینا یەعنی ژنەکەی قەصاص نەکرد لەجیاتی مردنی بشری کوڕی بەراء بەخواردنی گۆشتەکەی زەهراوی. بەڵام بەیهەقی گوتیتی پێشان وازی لێ هینا پاشان وەکوو بشر گەیشتە شەهادەت واتە بەگوشتەکە مرد ژنەکەی قەصاص کرد. (ڕەحمەتی خودا لەهەموومان بی).

٧٩٥: عَنْ سَهلِ ابن أَبِي حَثْمَةَ (ض) كَبِّر كَبِّر اتحلِفونَ وَتستَحِقُّونَ دَمَ قاتِلِكُمْ او صاحِبِكُمْ قالوا كيف نَحلِفُ وَلَمْ نَشْهَد وَ لمْ نَرَ قالَ فَتُبْرِئكُمْ يَهودُ بِخمسينَ. فقالوا كَيْفَ نَأخُذُ أَيْمانَ قَومٍ كفّارٍ فَعَقَلَهُ النبيُّ صلى الله تعالى عليه وسلم مِنْ عِنْدِهِ.

## تەرجەمە

٧٩٥: دەگێڕنەوە لەسەهلی کوڕی ابو حشمەی ئەنصاری مەدەنی ناو عبدالله (ڕەزای خودای لێ بی) گوتی عبداللەی کوڕی سەهلی حارثی موحیەصەی کوڕی مەسعودی کوڕی زەیدی لەگەڵ چەند ڕەفیقی تر بۆ خورماکڕین چوونە خەیبەر لەکاتی ئاشتی و صلح پاشان عبدالله و محیصە لەیەکتر جودا بوونەوە. پاشان موحەیصە بۆ جێگەی عبدالله چوو دیتی عبدالله لەکانییەک فڕەدراوە ملیان شکاندووە لەخوێنی خۆی وەردراوە وە کوژراوە. بەهەر حالێک شاردیەوە پاشان هاتەوە مەدینە عبدالرحمن ی کوڕی سەهل برای عبداللەی کوژراو: وەکوو خەبەری کوژرانی برای درایە کە زۆر گران بوو زانی لەگەڵ دووکوڕی مەسعود کە موحەیصەو حویصە بوون. بۆ خەبەردانی قەضیەی هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) عبدالرحمن چونکی جێگەرسۆز بوو لەبەر کوژرانی برای و مودەعیش بوو بۆ قەصنیە گێڕانەوە چووە پێش ئەگەرچی بچووکتر بوو لەڕەفیقان پێغەمبەریش (د) ئەگەرچی زانابوو کە مودەعی حەقی قسەی هەیە بەڵام موحەیصە لەئەصلی قەصنیە خەبەردارتربوو چونکی عبدالرحمن یش لەوی زانی بوو- نەی هێشت قسە بکا.

فەرمووی با گەورە قسەبکا. ئنجا عبدالرحمن سکوتی کرد موحەیصە قسەکەی بۆ گێراوە. پێغەمبەر (د) بەخطابێکی جەمعی فەرمووی ئێوە دەتوانن سوێند بخۆن لەسەر تەعینی قاتل (کوژەر) بۆ خاتری استحقاقی بەدەلی خوێنی قاتل بەلاّم مەبەستیشی لەم دووانە (خطابە) تەنیا عبدالرحمنی برای کوژراو بوو. چونکی لەوانیش مەعلوم بوو. سوێند لەسەر وارثە ئەوانیش گوتیان چلۆن سوێند بخۆین وەکوو ئەم کەسە کوژراوە ئێمە لەوێ حازر نەبووین وە کوژەریشمان نەدیوە بەچاوی خۆمان فەرمووی مادام ئێوە سوێند ناخۆن با جوولەکە پەنجا کەسی موتەهەمیان سوێند بۆ ئێوە بخۆن خۆیان لەدەعوای ئێوە نەجات بدەن- ئەوانیش گوتیان ئێمە چلۆن اعتبار بکەین بەسوێند خواردنی قەومێک کە کافرن؟

(ش): خطابی: گۆتیتی پێغەمبەر (د) بۆ سوێند ابتدای بە مودەعیان کرد وەکوو مودەعی سوێندیان نەخوارد سوێندی خستە سەر مودەعا علیهیان. ئەگەر فەرەزەن -فرضا- جوولەکەش سوێندیان نەخواردایە بەسوێندی مودەعی ڕازی بوونایە وە مودەعیش سوێندی بخواردایە قصاصی لەسەر جوولەکە لازم دەهات. بەلاّم لەقسامەت دەربارەی ئەم مادەیە مستثنایە چونکی لەقەسامەت غەیری دیەت نیە (قەصاصی نی‌یە لێرە نەبی).

ئەحکامی قەسامەت وەکوو سائری ئەحکامی تر نی‌یە لەگەلّ دەعوایەکانی تر موخالفە مەثەلەن لەگوندێکی پیس بەعەداوەتێکی پێشو یەکەکیان بریندار کرابێ یا کوژرابێ لەلایەن قەومێک پاشان یەکێک لەو قەومە دیتیان کوژرابوو لەو گوندە قاتلیش مەعلوم نەبوو وارثی کوژراوی قەومەکە پەنجا کەس لەئەهلی گوندەکە لەوانەی کە موتەهەمی خۆیەتی سوێندیان دەدا کە ئێمە بێ خەبەرین لەکوشتنی ئەم پیاوە لەپاشانیش دیەشیان لێ دەستێنی. بەلاّم لەقەضیەی ئەم جوولەکانە چونکی نە مودەعی سوێندی خوارد نەڕازیش بوو بەسوێندی مودەعا علیهی‌یەکان دیە نەکەوتە سەر جوولەکەکان بەلکی پێغەمبەر (د) لەخالص مالی خۆی سەد ووشتری دا (چونکی پێغەمبەر بەخۆی خاوەنی کاروباری موسولمانانە). موخالەفەی قەسامەت لەگەلّ دەعوایەکانی تر ئەمەیە: چونکی لەهەموو دەعوایەک سوێند لەسەر مودەعا علیهی‌یە. لەقەسامەت لەگەلّ هەبوونی دوژمنایەتێکی کۆن سوێندەکە لەسەر مودەعیە وە دیەش وەردەگری لەمودعێ علیە.

٧٩٦ عَن عوفِ ابْنِ مالِك (ض) أُعْدُ دسِتاً بيْنَ يَدي السّاعَةِ مَوتي ثم فتح بَيتِ المَقْدِس ثمَّ مُوتانٌ يأخذ فيكم كَقُعاص الغَنَم ثم استفاضَةُ المالِ حتّى يُعطي الرجُلُ ماءةَ دينار فيظَلُّ ساخِطاً ثمَّ فِتنَةٌ لايبقى بيْتٌ مِن العَرَبِ اِلاّ دخَلَتْهُ ثمَّ هدنَةٌ تكونُ بينكُمْ وبيْنَ بني ألاصفرِ فيغدِرونَ فيأتونَكُم تحتَ ثمانينَ غايَةَ تحت كُلِّ غايَةٍ إثنا عشر الفاً.

## تەرجەمە

٧٩٦: دەگێڕنەوە لەعەوفی کوڕی مالک ئەشجەعی ڕەزای خودای لێ بی گوتی هاتمە خدمەت پێغەمبەر (د) لەنێو خێوەتێک بوو لەچەرمی دەباغ کراو فەرمووی شەش نیشانە بژمێرە لەپێش قیامەت. ١- یەکیان مردنی من. ٢- دووەمیان گرتنی قودس. ٣- سێیەمیان مردنێکی زۆر ئەستوور عیلەتێکتان تووش دەبی وەکوو (عەصاصە) تووشی حەیوانات دەبی شتێک لەلووتی هەڵ دەڕژێ و لەناکاو دەمری. ٤- چوارەم پارە زۆر دەبی هەتا پیاو هەیە سەد دینار دەبەخشی ئەوی پارەکەی پێ بەخشراوە ڕقی دەبێتەوە ئەم مەبلەغەی پێ کەمە. ٥- پێنجەم فتنەیەکە هیچ ماڵێک لەعەرەب نامێنێ مەگەر بچێتە ناوی. ٦- شەشەم ئاشتی و کوشتار نەکردنێک لەبەینی ئێوەو لەبەینی بەنی ئەصفەر دەبی پاشان ئەوان غەدر دەکەن ئنجا دێنە سەرتان لەژێر هەشتا بەیداغ لەژێر هەر بەیداغێک دوازدە هەزار هەیە کە هەمووی دەکا نوسەدو شەست هەزار.

**«عن أنَس (ض) لكلِّ غادرٍ لواءٌ يوم القيامة يُنصَبُ».**

دەگێڕنەوە لەئەنەس و عبداللّه کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بی گوتیان پێغەمبەر (د) گوتی بۆ هەر کەسێک غەدری کردبی لەبەجێ گەیاندنی وەعدەی خۆی یەعنی وەعدەی دابی و بەجێشی نەگەیاندبی بەیداغێک هەیە نەصب دەکرێ بەنیشانە لەسەر ئەم صفەتە بەدەی یەعنی تا مەخلوقاتی مەحشەر بزانن ئەم پیاوە وەعدەی بەجێ نەگەیاندووە.

# کتـاب بـدأ الخَلق

## باسی سەرەتای دروست بوونی گەردوون

بسم الله الرحمن الرحیم

**٧٩٧: عَن عِمرانَ (ض) إقْبَلوا البُشری یابَنِي تُمیم إقْبَلوا البُشری. یا اهلَ الیَمَنِ اذا لمْ یَقْبَلْها بنو تَمیم کانَ اللّهُ وَلَمْ یکنْ شَیءٌ غیرَهُ وکَان عَرْشُهُ علی الماءِ وکَتَبَ في الذِّکْرِ کلَ شَیءٍ وَخَلَقَ السّموات والارضَ.**

### تەرجەمە

٧٩٧: دەگێڕنەوە لەعمرانی کوڕی حصین ڕەزای خودای لێ بی گوتی سالّی نۆیەمی هیجری چەند کەسێک لەبەنی تەمیم هاتنە خدمەت پێغەمبەر (د) فەرمووی ئەی بەنی تەمیم موژدەتان پێ دەدەم بەشتێک کە بەیانی مەبدەءو مەعادە موجبە بۆ ئەوەی بچنە ناو بەهەشت. گوتیان: یەعنی ئەقرەعی کوڕی حابس گوتی: موژدەت دا. ئێمە بۆیێ هاتوین هەندێ مالّمان پێ بدەی پێغەمبەر (د) لەجوابی ئەوان ڕوویی پیرۆزی گۆڕا چونکی بۆی ئاشکرابوو ئەمانە طالبی ئاخیرەت نین طالبی دونیان پاشان لەخەڵکی یەمەن ئەشعەری هاتن فەرمووی موژدەتان پێ دەدەم ئێوە موژدەم لێ قبوول بکەن چونکی بەنی تەمیم قبوولیان نەکرد. گوتیان قبوولمان کرد ئنجا پێغەمبەر (د) بەیانی دروست بوونی یەکەم جاری عالەمی بۆ کردن فەرمووی خودای گەورە هەبوو بە وجودی ئەزەلی بێ لەئەو هیچ شتێک نەبوو پاشان تەختی خودا دروست بوو (عەرش) لەسەر ئاو یەعنی بەینی عەرش و ئاو چۆل بوو هیچ نەبوو پاشان تەقدیری کردو اثباتی کرد هەموو شتێک لەجەواهرو ئەعراض و ئەفعال و ئەقوالی عالەم واتە کاکلّەو قەپێلک و کردەوەو قسەکانی خەڵک لەجێگایەک کە لەوح المحفوظە - پاشان ئاسمانەکان و عاردی دروست کرد. پاشان یەکێک بانگی کردم ئەی کوڕی (حصین). ووشترەکەت ڕای کرد منیش کەوتمە شوێن ووشترەکە لەبەر - سەرابی- کاتی نیوەڕۆ کە ببووە فاصل لەبەینی من و ووشترەکە باشم نەدەدیت والله حەزم دەکرد وازم لەووشترەکە بهینایە بەلاّم لەمەجلیسی پڕوەعزو ئامۆژگاری و حیکمەتی پێغەمبەر هەلنەستامایە.

(ش): واوی (وكان) (وَكَتَبَ) (وَخَلَق) لەم حەدیثە بەمەعنا (ثُمَّ)یە وا زاندرا لێرە لەم حەدیثە ئاو لەپێش هەموو شتێک بێ هەروەکوو ابن جریر وە غەیری ئەوانیش لە ابن عباس گێڕایتیانەوە لەمەعنای [وَكانَ عرشُهُ على الماءِ]. عەرشی خودای گەورە لەسەر ئاوبوو ئاوی لەپێش هەمووشتێک خەلق کرد وەکوو ئیرادەی فەرموو عالەم خەلق بکا دووکەلێکی لەئاو دەرخست لەسەرەوەی ئاو ڕاوەستا بوو بە -سماء- واتە ئاسمان - بۆ ئاو پاشان ئاوی ڕەق و ووشک کرد کردی بەیەک عارد پاشان چینەکانی (طبقاتی) عاردی لەیەکتر جوداکردەوە. بوو بە حەوت طەبەقە وەکوو عارد بۆیێ ئایەت دەفەرموێ -واللهُ خَلَقَ كُلَّ دابَّةٍ مِن ماء: وە دەفەرموێ وكان عَرْشُهُ على الماء. ئەگەر کەسێک بلێ مەبەست لەئاو لە (كُلّ دابة من ماء) - نوطفەیە: لەحەق دوورە چونکی نوطفە ئاوی موطلەق نی‌یە بەلکی قورئان تەعبیری داوە بەئاوی موقەیەد هەر وەکوو دەفەرموێ - من ماءٍ دافق يخرجُ مِن بينِ الصُّلْبِ والتَّرائِب - لەگەڵ ئەمەش زۆر حەیوانات هەیە لەنوطفە نی‌یە وەکوو کرمی مێوەجات -تەعین بۆ مەبەست (موراد) لەئاو ئەو ئاوەیە کە یەکێکە لە عەناصر -بوونی ئاو بەمەخلوقی أول لەعالەم منافی نی‌یە لەگەڵ والجان خلقناه من نار السموم یا لەگەڵ حەدیثی خُلِقَت الملائكةُ مِن نور - چونکی ئەصلی نورو نار واتە ئاگرو ڕۆناکی - ئاوە. انکاریش ناکرێ خەلقی ئاگر لەئاو چونکی خودای گەورە بەتوانای خۆی ئاوو ئاگری کۆکردووتەوە لەداری تەڕ - مِن الشَّجرِ الاخضَرِ ناراً فاذاهم توقدون - هەتا بەغایەتێک طبائعیون - واتە ئەوانەی دەلێن هەموو شتێک لەسروشتە -گوتوویانە ئاو بەهەلبرژانی خۆی ئەبێ بەبوخار ئەبێ بەهەوا هەوا ئەبێ بەئاگر. هەروەکوو لەبابەگوڕگوڕ لەشاری کەرکوک کە دەبینی بلێسە ئاگری گەورە کە پەیدا دەبی لەغازی پەیدابوو لەبەنزین -کە شلەیە-.

**٧٩٨: عَن أَبي هُرَيرَةَ (ض) يقول اللهُ شتَمني ابن ادَمَ وَما ينبغي لَهُ ان يَشْتِمَني ويكذِّبُني وما ينبغي لَهُ - اما شَتْمُهُ فقَولُهُ انَّ لي وَلَداً وَامّا تكذيبُهُ فَقَوْلُهُ ليسَ يُعيدُني كَما بَدَعَني.**

**تەرجەمە**

٧٩٨: دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بی) پێغەمبەر (د) فەرمووی خودای گەورە دەفەرموێ مرۆڤ کە کوری ئادەمە جنێوی بەمن دا کە لایقیش نی‌یە بۆ ئەو جنێو بەمن بدا و نسبەتی درۆش وەبال من دەدا ئەمەش بۆ ئەو لایق نیە. ئەما جنێوەکەی

ئەم قسەیە کە واپیشان دەدا دەربارەی هەبونی منداله بۆ من بەلام بەدرۆخستنەوەکەشی ئەمەیە دەلێ خودا دووبارە من زیندوو ناکاتەوە وەکوو جاری پێشوو کە منی دروست کرد لەدونیا. ئەمە قسەی بوت پەرستانە کە باوەڕی‌یان بەقیامەت نەبوو.

**٧٩٩: عَن اَبي هريرَةَ (ض) لَمَّا قضى اللّهُ الخلقَ كتبَ في كتابٍ فهُوَ عِندَهُ فوقَ العَرشِ اِنَّ رَحْمَتي غَلَبَت غَضَبي.**

## تەرجەمە

٧٩٩: دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خودای لێ بی پێغەمبەر (د) فەرمووی وەکو خودای گەورە لەتەجەلی پێشوو پێشی خەلقی عالەم ایجادی صورەتی هەموو عالەمی بۆخۆی کرد کە وەکوو ئاوێنە هەموو صفاتی جەمالیەو جەلالیەی خۆی تێدا بینی. چونکی دیتێ لەناو ئاوێنە غەیری دیتنی خۆیتی بەخۆی. ئەمری کردە قەلەم لەپاش کێشانی صورەتی ئەم هەموو عالەمە لەجەواهرو ئەفعال و ئەقوال حوسن و قبح و کفرو ئیمان - واتە لە کاکلەو قەپێلک و کردەوەو گوتن و باشی و خراپی و کافری و باوەڕهینان -باش و بەد بەهەر صفەتێکی هەیانە بنوسە. لەکتابێک کە لوح المحفوظه ئنجا ئەم کتابە لای خۆیەتی لەسەرەوەی عەرش (بزرە لە مەخلوقات هەستی پێ ناکرێ). کە بەڕاستی میهرەبانیم زاڵترە لە توورەبوونم. لەسەر موافەقەی قورئانی پیرۆز [کتب على نفسه الرحمة]. بەئیشارە وەباڵ ئەم حەدیثە هەروەکوو فریدالدین عطار بەفارسی گوتیتی:

**خودرا پدید کرد زخود سری خود دمی**

**هجده هزار عالمی اسرار امده**

ئنجا لەپیشاندانی پێشووی چلۆن عالەم نووسراو طەبع کرا گۆڕانی تێدانی‌یە ئەگەر نا لازم دی گۆڕانی عیلمی ئەزەلی بە جەهل ئەم کەمی‌یەش لەکردگاری کائنات مەحالە بۆیێ ئیمامی غەزالی فەرموویتی [ليس في الأمكان اَبَدعَ مما كان]. ئنجا ئەحوالی عالەم کە پیشان دانی بەرەبەرەو یەک لەدوویەکی دونیایە بۆیێ حەزرەتی عەلی فەرموویەتی [الناس يخافونَ من الخاتمة انا اخاف من الفاتحةِ] چونکی ئەحوالی بەدەرخستنی بەرە بەرەی دونیا کە ئاثارو شوێنەواری تابعی ئەحوالی پیشاندانی یەکەم جارە کە ئاثارزو شوێنەواری پیشاندانی (باطنه) کە یەکەم جار ڕووی داوە. یەعنی لەپیشاندانی یەکەم جار ئەگەر

جەوهری روحی لەسەر نوقطەی سەعادەت دانرابێ لەدونیا هەر سەعیدو کامەرانە لەقیامەتیش هەر کامرانە ئەگەر لەسەد نوقطەی شەقاوەت و بەد بەختیش دانرابێ لەهەمووی هەر بەدبەختە (کل شئ یرجع الی اصله) هەر شتەک دەگەڕێتەوە سەر بنچینەکەی . بۆیێ مەبەست لە نظر قضا ایجادی صورەتی عالەمە لەتەجەلی پێشوو چونکی (قضی) حەقیقەتەن بەمەعنای خەلقە هەر وەکوو فەرمویتی [فقَضاهُن سبع سماوات في یومین] بەلاّم بەمەعنا خەلقی بعد الفراغە. ئەمەش لەپێشاندانی پێشوو نەبێ نایەتە جێ چونکی خەلق لەتەجەلی پاشووی تەدریجی لەدونیاو لەبەرزەخ و لەبەهەشت و لەجەهەنەم دایە بێ بڕانەوەی خەلقی نیعمەت و عەزاب بۆ مؤمن و کافر.

یەعنی نابڕێتەوە کە فەراغەت تەحقوق بکا واتە هەر بەردەوامە.

**(تەواو بوو ئەمە بەرگی شەشەمە چاوەڕێی بەرگی حەوتەم بن لەم نزیکانە بەیاریدەی خودا)**